# بڕیار

لە پێناو گەلێکی
خاوەن بڕیاردا

86

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕیو گەشەپێدانی
مرۆیی لە کوردستاندا

سالّی هەشتەم
ئابی ٢٠١٥

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕیو گەشەپێدانی مرۆیی







ئەگەر ئەوکارە نەکەی
کەخۆشت دەوێت
ئەوا تۆ تەنها
کات بەفیڕۆ دەدەیت!
RASAN
Group

No : 86


**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار:

مەسعوود تـاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

د. عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@yahoo.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

ئەسـکەندەر ڕەحیم

بێگـەرد فـارس

زاهیـر زانـا

محەممـەد مێرگەیی

محەممـەد هاشـم

وەهـاب حەسـیب

یەحیـا محەممەد

گـوڵان حەمەئەمین

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر: ئازاد محێدین

**بەشی هونەری و دیزاین**

پشتیوان عبدالرحمن

**تایپ**

کەلسوم جەلال

**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی-

نهۆمی چوارەم- یەکەی (٤٠١) نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٠٧٤٨٠١١٢٧٨٧ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر

٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠ - ٠٧٥٠٥٢٥٣٠٣٥

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

facebook bryarmagazine

**دابەشکردن**

کۆمپانیای پەیك/ 07708649210

**چاپ**

کۆمپانیای پیرەمێرد



# چارەسەر تەنها بە قسەکردن نابێت!

بە ڕەشبینی بۆ هیچ شتێك ناڕوانم، تەنانەت بۆ خودی مەرگو تاریکیی شەوەزەنگو دژوارترین ساتەکانی ژیان.

وەلێ هەندێ بەڵا هەن گەورەن، بە ڕای من بۆ گەلان گەورەترین بەڵا قسەی زۆرو کرداری کەمە!

ئەگەر تەماشای کەناڵەکانی تەلەفزیۆن بکەیت، ڕۆژ تا ئێوارە، شەو تا بەری بەیان، هەر قسەیەو قسەش ناچێتە ناو گیرفانەوە.

چارەسەری کێشەکان تەنها بە قسە نابێت!

ئەوە، تەنها خەیاڵو وەهمو ڕاکردنە لە واقیع، ئەگەر ئێمە وا بزانین، تەنها بە وەسفی شاعیرانەو مێزگرتو دیبەیتو شرۆڤەی سیاسیو قسەی ڕەونەقدار، کێشەکانمان چارەسەر دەکەین!

بەڵام لە گۆڕەپانی کردارو بەرنامەو هەنگاوی پراکتیکی بۆ گۆڕینی گوفتارەکانمان، بۆ کردارو پڕۆژەی پێشکەوتنو پەرەپێدان زۆر هەژارین.

هەموو دەزانین برسی پێویستی بە نانەو تینوو بە ئاوو ڕووت بە جلوبەرگ، بەڵام تەنها بەمە کێشەکان کۆتاییان پێ نایەت!

هەزاران لێکۆڵینەوەو قسەو باس، کولێرەیەکی گەرم ناکات بۆ هەژارێك!

خولو سیمینارو وەرگرتنی بڕوانامەو گوێگرتن لە قسەی جوان، کارێکی خراپ نییە، بەڵام ئەگەر نەتتوانی لە ژیانی ڕۆژانەدا سوودی لێ وەربگریت، ئەوا تەنها بۆ چەند ساتێك قسەی خۆشت بیست!!بەڵام دواتر هەر دەبیتەوە کەسەکەی پێشتر!

لەبەرئەوە پێویستە لە بری کاتو بودجەو وزەیەکی زۆر بۆ چارەسەر بە قسە تەرخان بکەین، ئەو هەموو توانایە بۆ دانانی بەرنامەو پڕۆگرامو سیستەمی جۆراوجۆر تەرخان بکرێت!

هیچ گەلێك لەسەر دەستی سیاسیەکان فێری ڕێزگرتنی یاساو سیستەمو ڕۆشنبیریو بەهای بەرز نابێت!

هیچ گەلێك لە شەڕە کەڵەشێرو شەڕە قسەو ململانێی قێزەونەوە، فێری بەخۆداچوونەوەو پەسەندکردنی ڕەخنەو دانپیانان بە هەڵەکاندا نابێت.

هەرگیز کەسانێك ناتوانن پەرە بە ڕۆشنبیریو ئاستی هۆشیاریی خەڵك بدەن، کە خۆیان بە عەقڵی کەسانی دی بیر دەکەنەوەو بە زمانی دی دەدوێنو بە چاوی کەسانی دی دەبینن!

ئەوان تەنها دەتوانن بە گەرووی خۆیان بخۆن! هیچی دی!

خۆزگە ئەو مرۆڤانەی کە ماوەیەکی زۆر، خۆیان ماندوو دەکەن بۆ ڕێکخستنی یەك دوو وشەی بریقەدار، بە کردەوەیەکی کەم دەیانتوانی جوانترین گوزارش لە جوانیو بەرزیی خۆیان بکەن، بەڵام هەمیشە وەکو دەڵێن کە دەست کورت بوو، زمان درێژ دەبێت.

عوسمانی کوڕی عەففان هەڵبژێردرا بە سەرکردە، وەکو ڕێوڕەسم دەبوو بە وتارێك خۆی بناسێنێتو بەرنامەی خۆی ڕابگەیەنێت، بەڵام هەرچەندی کرد هیچی بۆ نەگوترا!

کە هاتە خوارێ لەسەر مینبەرەکە، گوتی: ئێوە پێویستتان بە سەرکردەیەکی ئیشکەر زیاترە، تا سەرکردەیەکی قسەکەر!

ڕاهیبێك خەونی هەرە گەورەی ڕاڤەکردنی کتێبێکی پیرۆز بوو بە زمانی ژاپۆنی، بۆ ئەم مەبەستە هەموو ژاپۆن گەڕا بۆ کۆکردنەوەی خەرجی چاپکردن، بەڵام بەهۆی لافاوو شەپۆلی دەریاوە کارەساتێکی گەورە ڕووی دا، ناچاربوو هەموو ئەو پارەیە بۆ چارەسەری کێشەکانی خەڵك سەرف بکات، جارێکی دی هەمان هەوڵی دا، بەڵام نەخۆشییەکی دژوار ڕووی کردە وڵاتەکەیو ناچاربوو ئەمجاریش پارەکەی بۆ ئەو مەبەستە ببەخشێت، تا لە کۆتاییدا دوای (٢٠)ساڵ توانی کتێبەکەی بڵاوبکاتەوە!

بەڵام وەك دەڵێن لە ڕاستیدا (٣)جار ئەم کتێبەی چاپ کرد!، بەڵام (٢)جاریان نەبینراو بوو!

با لەو کەسانە بین کە بە بێدەنگی قسە دەکەنو بە کردار دەدوێنو کرداری جوانیان زۆر لە قسەی جوان پێ جوانترە!!

# کارگێڕی بە گوفتار

خۆت پڕ چەک بکە بە زانست،

باشترە لەوەی بە خشڵو گەوهەر خۆت بڕازێنیتەوە!

**پەندێکی چینی**

زانست بەبێ کردەوە، وەکو کەشتی وایە بەبێ کەشتییەوان.

**جۆرج بەرنادشۆ**

تەندرووستی وەکو هێلکە وایە،

ئەگەر پارێزگاری لێ نەکەیت.. دەشکێت!

**پەندێکی مەغریبی**

هەرگیز تف مەکەرە نێو بیرەوە؛

چونکە لەوانەیە ڕۆژێک دابێت پێوستت پێی بێت!

**پەندێکی ڕووسی**

ڕوخساری بێخەندە، وەکو باخی بێدرەخت وایە!

**پەندێکی دانیمارکی**

# دزی لە خۆت مەكە!




بەیانییەكی ساڵی ١٨٨٧ بوو، كە بەڕێز ئیمانوئیل نینجر وەكو هەموو ڕۆژێكی یەك شـەممە، دەچووە فرۆشگای گەڕەكی خۆیان؛ بۆ كڕینی بڕێك سـەوزەو بۆ ئەم مەبەسـتەش (٢٠) دۆلاری دایە ئافرەتە فرۆشیارەكەو چاوەڕوانی باقی بوو!

لـەو كاتەدا كـە ئافرەتەكـە دەیویسـت باقـی پارەكەی بۆ بگێڕێتەوە، تەماشای كرد، مەرەكەبی پارەكە بە دەستە تەڕەكانیدا هاتنە خواریّ!

بەبینینی ئەم دیمەنە، تووشـی شـۆك بوو، ماوەیەك وەستاو بیری كردەوە، بەڵام لە كۆتاییدا گوتی: "ئەمە ئیمانوئیل نینجری دراوسیّو هونەرمەندو دۆستی قەدیمە، بێگومان پارەیەك ڕەسەنو ساغ نەبێت نامداتیّو هەرگیز شتی واناكا"

بـەڵام لەبەرئەوەی بـۆ ئەو كاتـە (٢٠)دۆلار بڕێكی زۆربوو، ناچاربوو پۆلیس ئاگادار بكات، تا لە كۆتاییدا ناچاربوون ماڵەكەی بپشكنن!

لـە ژێرزەمینـی ماڵەكەیـدا هەمـوو ئامێـرو كەلوپەلێكی تەزویركردنی دراویان دۆزییەوە، بەڵكو سكەیەكی (٢٠)دۆلاریشیان دۆزییەوە كە لە ژێر چاپكردندا بوو!

وێڕای ئەوەی كە (٣)تابلۆشـیان بینی كە "نینجر" بەدەستی خۆی كێشابووی!

"نینجـر" هونەرمەندێكـی داهێنەر بوو بە مانای وشـە، بە دەسـتی خۆی وێنەی دراوەكانی دەكێشـا، بە شێوەیەكی وەها كە بـۆ ماوەیەكـی زۆر هەموانی فریودابوو، خۆ ئەگەر ئەو دەسـتە تەڕانە نەبوونایە، ئەوا بەئاسـانی ئاشـكرا نەدەبوو، دوای ئەوەی ڕاپێچی زیندان كرا، هەرسـیّ تابلۆكەیان بە (١٦٠٠)دۆلار فرۆشت، واتـە: هەر تابلۆیەك بە زیاتر لـە (٥٠٠)دۆلار، ئەوەی كە جێگای سەرسـوڕمانو هاوكات گاڵتەپێكردنیشـە كە (نینجر) هەمان ئەو كاتەی بۆ درووستكردنی (٢٠)دۆلارییەك تەرخان كردو بە هەمان كاتیش دەیتوانی تابلۆیەكی (٥٠٠)دۆلاری بنەخشێنێت!

بەڵام بەداخەوە تواناكانی بە شـێوەیەكی نەرێنی بەكارهێناو هەرچەندە دزێكی شارەزابوو، بەڵام پێش هەموو كەسێك دزی لە خودی خۆی كرد!

**لەم چیرۆكەوە فێردەبین:**

١- ئەم كابرایە دەیتوانی دەوڵەمەندییەكی باشو ناوبانگێكی جـوان، بۆخۆی بەدەسـت بهێنێت، ئەگەر بهاتبایـە تواناكانی لە ڕێگایەكی درووستدا بەكاربهێنایە!

٢- دەیتوانـی ژیانێكی پڕسـەربەرزیو كەرامـەت، بەڕێزەوە بۆخۆی دەستەبەر بكاتو بە خۆشیو دڵنیاییەوە بژی.

٣- كەسـانێكی زۆر كـە خەریكـی دزینی كەسـانی دین، لە كاتێكدا پێـش هەموو كەس، خودی خۆیـان دزیوەو گەورەترین دزییان لە خۆیان كردووە!

٤- ئەو كەسـانەی بە ڕێـگای نامەشـرووعو دزیو فێڵكردن سەروەتو سامان كۆ دەكەنەوە، دەتوانن بە ماندووبوونی خۆیانو بە ئارەقی ناوچەوانیان پارەی حەڵاڵ كۆ بكەنەوەو بەئاسوودەیی چێژی لیّ وەربگرن.

٥- چـی خۆشـییەك لە ماڵو سـامانێكدا هەیـە، كە هەموو خەڵكـی بزانن هی خۆت نییەو لە قووتی هەژارانو لێقەوماوانت گرتۆتەوە؟!

٦- ئەوانەی موڵكو سـەروەتو داهاتی هـەژارانو بێباوكانو بێكەسـان دەدزن، سـتەم لـە خودی خۆیـان دەكەن، بەئاسـانی دەیانتوانـی ئەو بڕە پارەیەی پێویسـتیانە، بـە ڕێگایەكی پاكو درووست بەدەستی بهێنن!

٧- ئەو میللەتەی كە ناتوانێت شـانازی بە سـەركردەو زاناو هونەرمەندەكانییەوە بكات، چەند داماوو هەژارو سەرگەردانە!!

٨- هەرگیـز نەهێڵـی خەیاڵـی لەپڕبوون بە كـوڕ، وات لیّ بكات، دزی لە خۆتو نەتەوەو نیشتمانت بكەیت، دەستە تەڕەكان هەمیشە ڕۆژێك دەبێت، هەموو شتیّ ئاشكرا بكات!

# تەنها بۆ سەرکردەکان

پیاوی ئازا، ئەو کەسەیە کە بەرپرسیارێتیی
سەرەنجامی کارەکانی، دەخاتە ئەستۆی خۆی!
(هیتلەر)

هەر کەسێک لەگەڵ کەسێکی نەزاندا، مشتومڕ بکات،
دەبێت بەرگەی وەڵامەکەشی بگرێت!
(پەندێکی ئەڵمانی)

ئەو کەسەی لەسەر زەوی دادەنیشێت،
ناترسێت لەوەی بکەوێتە خوارەوە!
(پەندێکی چینی)

هیچ کەس ناتوانێت بچێتە سەر پشتت،
ئەگەر خۆت بۆی دانەنەویتەوە!
(مارتن لۆسەر کینگ)

ئەگەر ویستت وەفاداری پیاوێک تاقی بکەیتەوە، ئەوا بڕوانە بۆ سۆزو خۆشەویستی بۆ
نیشتمانەکەی و هاوخەمی و دڵسۆزی بۆ هاوڕێکانی!
(ئەسمەعی)

سامان کەریم

# پلان






## پلانی سەرژمێریی دانیشتوان

**پێناسەیەکی گشتگیر بۆ پلانی (سەرژمێریی دانیشتوان):**

پلانی سەرژمێری، واتە: ئامار بۆ هەموو بەشەکان، بۆیە بە دایکی پلانەکان ناو دەبرێت؛چونکە ئەم پلانە، کارئاسانیمان بۆ دەکات؛ بۆئەوەی زۆرینەی پلانەکانی دیکە جێبەجێ بکەین. دیارە کە دەڵێین: سەرژمێری، مەبەستمان تەنها زانینی ژمارەی دانیشتوان نییە، بەڵکو زۆر لایەنی گرنگی دیکە دەزانین، کە پەیوەستە بەهەموو کایەکانی ژیانەوە.

سەرباری ئەوەی کە تاکو ئێستا ژمارەی ڕاستەقینەی هاوڵاتیانی هەرێمی کوردستان، نازانرێت چەندە، بەڵام تاکو ئێستا سەرژمێریی دانیشتوان وەك دەزانین، هەر بە شێوازە تەقلیدییەکە دەکرێت، کە ١٠ ساڵ جارێك دەکرێتو تەنها بۆ زانینی ژمارەی دانیشتوانی ئەو سنوورە جوگرافییەی کە خەڵکی تێدا نیشتەجێ بووە، ئیدی دوای ئەوە، کەس نازانێت چەند کەسو خێزان زیادو کەمی کردووە، یان چەند کەس لەدایکبووە؟ ئاستی تەمەنی دانیشتوان چەندە؟ کە زۆر گرنگە لەبەرئەوەی نازانین کۆمەڵگا بەسەر ئاستی تەمەنەکاندا چۆن دابەش بووە؟! یان ڕێژەی خوێندەواری چەندە؟ یان ژمارەی خێزانی کرێنشین چەندە؟ کە یەکێکە لە گرنگترین ئامارەکان؛ بۆ نەهێشتنی کرێنشینیو بەرزکردنەوەی داهاتی خێزانی؟ بۆچی؟ چونکە خێزانێك کە کرێنشین نەبوو، ئەو پارەیەی کە بۆ کرێنشینی دەڕوات، دەبێت بە پاشەکەوت بۆ خێزانو خۆشگوزەرانی درووست دەبێت. زۆر لایەنی گرنگی دیکەش، کە بەش بە بەش، لەم پلانەدا ڕوونیان دەکەینەوە.

**پلانی سەرژمێریی دانیشتوان، چەند لایەنێك دەگرێتەوە کە ئەمانەن:**

١. **دانیشتوانی هەرێمی کوردستان:** ئەو هاوڵاتییانە دەگرێتەوە، کە لە سنووری جوگرافیای هەرێمی کوردستاندا نیشتەجێنو خاوەنی ناسنامەی ئەسڵی هەرێمی کوردستانن، پلانەکەمان بۆ ئەم بەشەیە.

٢. **دانیشتوانی دەرەوەی هەرێمی کوردستان:** ئەو هاوڵاتییانە دەگرێتەوە، کە مافی پەنابەرییان لە وڵاتێکی دەرەوەی کوردستان وەرگرتووەو نیشتەجێی ئەوێن، بەڵام خەڵکی هەرێمی کوردستانن، ئەم بەشە ناگرێتەوە؛ چونکە ئەوان لەسەر هەرێم حساب نین، بەڵام خەڵکی ئێرەنو هەرکاتێك بڕیاری گەڕانەوەی یەکجارییان داو هاتنەوە ئێرە، ئەوە ناسنامەی ئێرەیان دەبێت؛ چونکە ئێمە دەمانەوێت بزانین، ئەم سنوورە جوگرافییەی کە پێی دەوترێت: هەرێمی کوردستان، چەند هاوڵاتی ئەسڵی هەرێمی کوردستانی لەسەر دەژی.

٣. **دانیشتوانی وڵاتە دراوسێکان:** ئەو هاوڵاتییانە دەگرێتەوە، کە خەڵکی ئێرە نین، بەڵام بەهەرهۆیەك بێت لێرە بەشێوەی بەردەوام نیشتەجێنو لێرە کاردەکەن، ئەم بەشەش ناگرێتەوە، بەڵام دەبێت بزانین ژمارەیان چەندەو زانیارییان لەسەر بزانین.

٤. **گەشتیاران:** ئەو هاوڵاتیانە دەگرێتەوە، کە وەك گەشتیار لێرەن، ئەم بەشەش ناگرێتەوە.

**ڕوونکردنەوە:** کە دەڵێین: ئەو سێ بەشە ناگرێتەوە، مانای ئەوە نییە ئاماری ئەوانە نەزانین؟! بەڵکو دەبێت ئاماری ئەوانەش بزانین، بەڵام ئەمەی کە باسی دەکەین، مافی هاوڵاتیبوونە لێرە، کە دواتر شیکردنەوەی زیاتری لەسەر دەکەینو مەبەستمان پێی چییە، کە تەنها بەشی یەکەم دەگرێتەوە.

**ئەم پلانە کێ دەگرێتەوەو کێ ناگرێتەوە؟**

ئەم پلانە تەنها ئەو هاوڵاتییانە دەگرێتەوە، کە لە سنووری هەرێمی کوردستان نیشتەجێن لە دێرین زەمانەوە، خاوەنی ڕەگەزنامەی ئەسڵینو بە مێژوو، خەڵکی هەرێمی کوردستانن.

لە ئێستادا ئەم بەشانە ناگرێتەوە:

١. لە ئێستادا کەرکووك.

٢. ناوچە دابڕاوەکانو کێشە لەسەرەکان.

٣. پارچەکانی دیکەی کوردستان.

٤. ئەوەی دانیشتووی سنووری جوگرافی هەرێمی کوردستان نەبێت.

٥. قەرەجو کۆچەرە نارەسمیەکان.

**تێبینی گرنگ:**

**یەکەم:** سەبارەت بە خاڵی یەکەمو دووەم، کاتێك ئەم پلانەم داڕشت، ئەم دۆخەی کە ئێستا، لە ئارادا نەبوو، گەر هاتوو حکومەتی هەرێم، بڕیاری جیابوونەوەی دا، ئەو کات دەبێت ڕاستەوخۆ سنووری جوگرافی دیاری بکرێتو ئیدی ئەم سیاسەتی دەستییە کۆتایی پێ بێت.. بەپێی بەڵگەنامە مێژووییەکانیش، سنووری جوگرافی کوردستان لەکوێوە بۆ کوێیە دیاری بکرێتو دانووستان لەسەر یەك بستیشی نەکەین؛ بۆئەوەی ئیدی ئەم دەستەواژانە کۆتاییان پێ بێت.

گەر جیابوونەوە ڕووی نەدا، ئەو کات دەبێت حکومەتی هەرێم دیاری بکات، چ سنوورێك ئەم پلانەی تێدا جێبەجێ بکرێت.

**دووەم:** سەبارەت بە خاڵی سێیەم، کە پارچەکانی دیکەی کوردستانە، ئەم پلانە سەرەتایە بۆ ئەو کاتەی کە ئەو پارچانەش بوون بە هەرێمێکی خۆبەڕێوەبەری، تاکو دەوڵەتی کوردستانی گەورە، واتە: داڕشتنی ئەم پلانە، وەها ئەنجام دراوە، کە هەرکات پارچەکانی دیکەیش هاتنە سەر هەرێمی کوردستانو دەوڵەتی کوردستانی گەورە درووست بوو، بتوانین پارچەکانی دیکەیش بخەینە سەر کوردستان.

# سەلیقەی کارگێڕی

**بەڕێوەبەردنی خەڵکی واتای چی؟**

بۆئەوەی ببیت بە بەڕێوەبەرێکی چاك، پێویستە:

دەروونناس

هاندەرو هیوابەخش

هاوڕێ

مامۆستا

مەردی ئەرکە دژوارەکان

سەرکردە

بیسەر

.. بیت، ئەمانەی سەرەوە، بەس سەرەتاکەیەتی، جارێ بسم الله..

**یەکەم ڕۆژی دەستبەکاربوونت:-**

لە سـەروبەندی ڕۆژانی سـەرەتای کارە تازەکەتدا، پێشنیازی ئەوە دەکەین، کە یەکەم بنەما لە بنەماکانی کارگێڕیی درووسـت جێبەجێ بکەیت، ئەویش:

**بنەمای کارگێڕی بە چاودێرییە.**

چەند ڕۆژێکی کەمی سـەرەتاو ڕەنگە ماوەیەکی دیکە قەیدێ نـەکات، هەر هیچ نەبێ، تا ئەو کاتەی چاك چاك دەزانی چی لە دەوروبەرت ڕوو دەدات، وا باشترە:

بەهێمنیو هێوری بمێنیتەوە.

گوێ بۆ گشت شتێك ڕابگریت.

بەکەمی نەبێت، نەدوێیت.

زۆر بەکورتیـش: چاوەکانـت با هەمیشـە کراوەو دەمیشـت داخراو بێت. کورد گوتەنی: سەرکزی دڵوریا بە.

**ئاگات لە خۆت بێت:**

هەڵەکردن ئاسـانە، بەتایبەت لە ڕۆژەکانی سـەرەتای کاردا، کە ڕۆژانی شـێواویو شپرزەیین، پاشان چەند هەفتەیەك، ڕەنگە چەند سـاڵێك بەسـەر ببەیت؛ تا ئەو هەڵانە، بەتەواوی ڕاسـت بکەیتەوە.

بۆئـەوەی وریـا بیتو ئـاگات لە خۆت بێـت، نەکەویتە نێو هەڵەوە، چەند یاسـای سـەرەکی، یـان ڕێنوێنیمـان هەیە، ئەو شـتانە دەستنیشان دەکەن، کە پێویسـتە وەك بەڕێوەبەرێك، لە هەفتەکانی سەرەتای کارەکەتدا ئەنجامیان بدەیت. ئەوانیش:

**خۆت لە بوغراییو باییبوون بەدوور بگرە:-**

بە جۆرێك نەیەیتە سـەر کار؛ هێندە کەشـوفشو لوتبەرزی بنوێنێـت، وەك ئەوەی لە لووتی فیـل کەوتبیتە خوار، یان وەك بڵێیت پاڵـەوانو قارەمانو شۆڕسـواری مەیـدان هەر خۆتیت؛ بۆئەوەی دابو دەستوورو شیرازەو ڕێوشوێنە باوەکان، سەرلەبەری هەڵبوەشێنیتەوەو تێکی بدەیتو بە هەموان بڵێیت:

بەبێ پرسـی من، پەنجە نەخەنە ناو ئاویشـەوە، لە ئێسـتە بە دواوە، سـەرتاپای شتەکان بگۆڕێن؛ چونکە بەرپرسی سەرەتاو کۆتایی، هەر خۆمم.

بەدڵنیاییـەوە، هەندێك شـت هـەن، دەگۆڕێن، بـەڵام گۆڕینی هەموو شـتێك دەسـت نادات؛ چونکە چەند شـتێك هـەن، لەبەر کۆمەڵـە هۆکارێکـی بابەتیانە، هاتوونەتە ئـاراوە. تا کاتێکیش لەو هۆکارە شاراوانە دڵنیا دەبیتەوە، کە لە پشت ئەنجامگەیاندنی بڕێك کارەوەنو خۆشـیت لە شێوازەکەیان نایەت، وا گونجاو ژیرانەترە، لە گۆڕینی شێوازەکەی پەلەت نەبێتو زۆرتر چاوەڕێ بکەیت.





# ئاسنگەرێکی لاو

و: بوشرا ئەبوبەکر

ئاسنگەرێکی لاو دەڕوات بۆ گوندێك، بە مەبەستی کاری ئاسنگەری، ئەو لە کاری ئاسنگەریدا زۆر لێهاتوو بەتوانابوو، دەیتوانی کەرەستەی جیاواز بەجۆری باشو نرخی گونجاو درووست بکاتو پێشکەشی خەڵکی بکات، لە سەرەتادا کاری زۆر باشبوو کەلوپەلەکانی زۆر زوو دەفرۆشرانو خەڵك زۆر لێی ڕازیبوون، بەڵام وردە وردە داواکاریو ویستی خەڵك بۆ کەلوپەلەکانی کەمبووەوە، بەجۆرێك ئیدی دەرامەتەکەی بەشی ژیانی ئاسایی خۆی نەدەکرد، پاش ڕۆیشتنی چەند هەفتەیەك، بارەکە خراپتربوو، ئیتر تەنانەت کەسێکیش بۆ لای ئەو نەدەچوو، هۆکاری ئەوەی کە خەڵك لە ئاسنگەری لاو دوور کەوتبوونەوە بریتی بوو لەوەی کە بەردەوام بە خراپ باسی ئاسنگەرە بەساڵاچووەکەی گوندەکە دەکردو لە گوتنی هیچ گوتەیەکی خراپو ناڕاست بەرامبەر ئاسنگەرە پیرەکە ڕانەدەوەستا، بەڵام ئاسنگەرە پیرەکە سەرەڕای ئەوەی کە تەمەنێکی زۆری هەبوو، زۆر جوامێرانە کاری دەکردو باسی کەسی دیکەی نەدەکرد، هیچ ناڕەزایی لەسەر هاتنی ئاسنگەرە لاوەکە دەرنەدەبڕی، ئاسنگەری لاو ڕۆژێك ڕۆیشت بۆ لای پیاوێکی دانای گوندەکەیان، تا هۆکارەکانی پێبڵێتو چارەسەری بۆ دەستنیشان بکات، بە داناکەی گوت: مامۆستا دەبینی چ بەڵایەکم بەسەردا هاتووە؟ ئاسنگەری پیری گوندەکەمان بەبێدەنگیو خۆ داماوکردنی، وای کرد کە خەڵکی گوند لە من دوور بکەونەوەو بەرەو لای ئەو بڕۆن، ئیتر من هیچ کارێکم پێ ناکرێت، ناچارم هەموو ئەو شتانەی کە لەم ماوەیەدا درووستم کردوون، بەنرخێکی کەم بیانفرۆشمو لەم گوندە بڕۆم، ئەم خەڵکە شایەنی ئەوەن، ئەو شتە بێ کەڵکانە بەکاربهێنن کە ئەو ئاسنگەرە پیرە درووستیان دەکات، داناکە بە خەندەوە گوتی: تۆ خۆت بەتەنها خاوەنی هێندە بەهرەو توانایت، کە خەڵك لێت ڕازی بنو خۆشیان بوێیت، ئەگەر کارت بە کاری کەسەوە نەبێتو بەو بەهرەو هونەرەی کە خاوەنیت، دەتتوانی شایستەییو هێزی خۆت پیشان بدەیتو ساڵەهای ساڵ لە ناو ئەم خەڵکەدا خۆش بژیتو لە ناویاندا بدرەوشێیتەوەو کەس دوژمنایەتیت نەکات، بەڵام تۆ چونکە هەموو شتێکت بۆ خۆت دەویست، ئیرەیی چاوی کوێر کردبوویت، لەگەڵ ئەو هەموو تواناو بەهرەیەی کە هەتبوو، بەهۆی دوژمنایەتیکردنو قسەی خراپگوتن بەکەسێك، کە بێدەنگ بوو، نەتتوانی سەر بکەویتو شوێنی خۆت لەدڵی خەڵکدا جێگیرو پارێزراو بکەیت. بە دەستی خۆت، ڕێزو شکۆی خۆتت لەناو خەڵکدا لەناو برد. بۆئەوەی خۆشەویست بیت لەناو خەڵکدا، پێویست بەوە ناکات، کەسانی دیکە ناشیرین بکەیتو تۆمەتیان بخەیتە پاڵ، باش بزانە هۆکاری تەنهاییو بەدبەختییەکانت تەنها خۆتیت. بۆ چارەسەری ئەمە، تەنها پێویستە واز لە قسەو تۆمەتی ناڕەواو ئیرەیو چاوچنۆکی بهێنیت، ئەو کات دەبینیت پاش تێپەڕبوونی ماوەیەك هونەرو تواناکانت تۆ لە لای خەڵك خۆشەویست دەکەنەوە. ئاسنگەرە لاوەکە خەندەیەکی تاڵی کردو گوتی: لەم گوندە هێندە کاری خراپم کردووە، بڕوا ناکەم بەم زوانە لەبیری خەڵکەکەی بچێتەوە، بۆ گوندێکی دیکە دەڕۆمو بەو جۆرەی کە گوتتان دەژیم.

ڕۆژی دواتر ئاسنگەرەکە هەموو کەلوپەلەکانی کۆ کردەوەو گوندەکەی بەجێ هێشت، گوندێکی دیکەی دۆزییەوەو لەوێدا دەستی کرد بەکارکردن، بەڵام ئەم جارە تەنها سەر قاڵی کاری خۆیبوو. پاش تێپەڕبوونی ساڵێك، داناکە ڕێی کەوتە ئەو گوندەی ئاسنگەرە لاوەکە کاری تێدا دەکرد، بینی دوکانەکەی گەورە بووەو خەڵکانێکی زۆر شتی لێدەکڕنو وەسفی تواناو لێهاتویی ئاسنگەری لاو دەکەن، کاتێك ئاسنگەرەکە داناکەی بینی، گوتی: دەبینی مامۆستا کارەکانم زۆرباش بەڕێوە دەچن، زۆرکات کەسانی گوندەکەی ئێوەش دێنو کەرەستەم لێ دەکڕن، تەنانەت ئاسنگەرە پیرەکەی ئێوە، کاتێك زۆر سەرقاڵ دەبێت، مشتەرییەکانی خۆی دەنێرێت؛ تا لەمن کەلوپەل بکڕن، ئێوە زۆر ڕاستتان گوت، ئیرەیو چاوچنۆکی، مرۆڤ بەرەو لەناوچون دەبەن.

سەرچاوە: Niksalehi site



# گەشەپێدانی ئابووری

ن: د. عبدالكريم بكار
و: حسێن نەجمەدین قەرەداغی

## بەشی دووەم

بۆ بەرچاو ڕوونی خوێنەران، بە پێناسەی گەشەپێدانی ئابوری لە دیدگای هزری ئیسلامەوە دەست پێ دەکەین:

کە کۆمەڵێك چالاکییە بە ئامانجی بەدەستهێنانی خۆشگوزەرانی دارایی گونجاو، بۆ تەواوکردنی لایەنەکانی کەسێتی مرۆڤ، وە فەراهەمکردنی ئامادەسازی بۆ هەستان بە ئەرکی جێنشینی خودا لەسەر زەویدا.

فەرمودەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، (نعم المال الصالح لرجل الصالح)، کە ئیمامی ئەحمەد گێڕاویەتیەوە، ئاماژەیەکی ڕوونو ئاشکرایە بۆ دیدو تێڕوانینی ئایینی ئیسلام بۆ بوونی ماڵو دارایی، بوونی دارایی بەشێوەی شەرعیو حەڵاڵ ستایشکراوە کاتێك دەکەوێتە دەستی مرۆڤێکی باش، سوودی لێ وەردەگرێت بۆ گەشەپێدانی خۆیو دەیبەخشێت لە کاری خێرخوازیدا، هاوکاری چاکسازی ئەوانی دیکەیش دەکات، بە چارەسەرکردنی بەشێك لە گرفتو پێداویستییەکانیان، ئەمەش ئەوە نیشان دەدات، کە گەشەپێدانی ئابووری، بەشێکە لە گەشەپێدانی هەمەلایەن.

### بنچینەو هەڵسەنگاندنی گەشەپێدانی ئابووری:-

ئەو گرفتانەی لە بواری چارەسەری گەشەپێدانو ئابووری ئیسلامدا بەشێوەیەکی گشتی دەردەکەوێت بەشێکی ئەمانەن:

١- بەشێکی زۆر لە لێکۆڵەرەوەکان بۆ چارەسەرکردنی گرفتی گەشەپێدان لە بنچینەو دەرهاویشتە گشتییەکاندا دەمێنێتەوە، بێئەوەی پرسیار لە چۆنێتیی جێبەجێکردنو پراکتیزەکردنی بکەن لەواقیعدا، کەمێکیان نەبێت پرسیاری ئەوە ناکەن بۆچی باشترین تیۆری گەشەپێدانمان هەیە، بەڵام لەواقیعدا لە خراپترین باری داراییدا دەژین.

زۆربەیان دەڵێن: پێویستە لەسەر دەوڵەت (میری) کە پێداویستییە بنچینەییەکان بۆ خەڵك دەستەبەر بکات، ناپرسن دەوڵەت ئەو داراییو پێداویستییانە لە کوێوە بهێنێت، کە لە وڵاتدا کەم بێت، دانیشتوان زۆر بێتو ناپرسن ئەو میکانیزمە چییە کە بڕیارەکانی حکومەت ڕاست بکاتەوە کە پێچەوانەو نارێکە لەگەڵ تیۆری ئابوریی ئیسلامی، یان بەرژەوەندیی هەژارانو چەوساوەکان.

هەندێکیان دەڵێن: دەگمەنی، یان نەبوونی سەرچاوە، گرفت نییە، لە کاتێکدا ئەوە دایکی گرفتەکانە، هەندێکیان دەڵێن، ئاینی ئیسلام دان بە هەژاریدا نانێت (نایناسێت) لە کاتێکدا زۆربەی ڕۆڵەکانی جیهانی ئیسلامی لە هەژارەکانن!!

ڕەوتی نموونەیی (مثالي) بەسەر زۆربەی نووسەرەکانماندا زاڵە، ئەمەش هۆکارەکەی ئاشکرایە، سەردەمی هەڵوەشانەوەو لاوازی بەسەر موسوڵماناندا هاتووە، کاتێك موسوڵمانان بەئاگا هاتنەوە، خۆیان لە بارێکی شارستانیی خراپدا بینییەوە، کە یارمەتیدەر نییە بۆ نوێگەریی بیری گەشەپێدانو بەراوردکردنی ڕاستو درووست!

٢- کەمی توانای بەکارهێنانی بیرو هەست بەشێوازی جۆراوجۆر؛ بۆئەوەی بگەینە دەرئەنجامو گرێبەستی کۆتایی، کاتێك ئێمە بیروڕا ئاڵوگۆڕ دەکەین ئەوە بە خەیاڵی بیسەردا دێت، کە ئێمە ناکارینو ناتوانین لەسەر هیچ شتێك ڕێك بکەوین.

گرنگی هەڵسەنگاندنی کۆتایی ئەوەیە، کە ڕزگارمان بکات لە دۆزو بیری لاوەکیو ناوەندیو کاتی، بمانخاتە سەر ڕێگای دەست پێکردنو گەشتن بە ئامانجو دەستنیشانکردنی ئەو شتانەی کە کارەکە بێ ئەوانە تەواو نابێت، بۆ نموونە: ئەگەر پاش گفتوگۆ گەشتینە ئەو ئەنجامەی کە لە پیشەسازیدا دواکەوتووینو پێویستە خۆمانی لێ ڕزگار بکەین، لە کوێوە دەست پێ بکەین؟؟

کەسێك دەڵێت، فراوانکردنی خوێندنی پیشەیی، درووستکردنی سەنتەری لێکۆڵینەوەی پێشەنگ، لە پێناوی بڵاوکردنەوەو باشکردنی ئاستی پیشەسازیو کەمکردنەوەی بڕی تێچوون، ئەگەر ئەم سەرەتایەمان پەسەند کرد، ئەوا پێویستمان بە پارە هەیە، ئەم پارەیە لە کوێوە بهێنین؟؟؟ هەندێك دەڵێن ئەو پارانە لە باجو بەرهەمهێنانەوە دێت، بەڵام ئەوەی لای دەوڵەتەوە دێت لە کردنەوەی قوتابخانەی سەرەتاییو هاوکاری خواردنو تەندرووستیو بەرگریو پاراستنی ئاسایشدا خەرج دەکرێتو ئەو باجو داهاتانەی کە دەگاتە دەوڵەت کەمەو بەپێی پێویست نییە، بەهۆی گەندەڵییەوە باجەکان ناگاتە خەزێنەی دەوڵەت، بەڵکو بۆ گیرفانی هەندێ لە باجکۆکەرەوەکانە، ئەمەش نیشاندەری ئەو ڕاستییەیە کە زیادکردنی باج، سوودێکی ئەوتۆی نییە.

بەم شێوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە باشکردنی باری پیشەسازی، پەیوەستە بە گۆڕینی مرۆڤەکانەوە، لە ڕوانگەی گۆڕینی پلەبەندی بەهاکانیو لەڕوانگەی دەوڵەمەندکردنی بە هۆشیاریو زانستی لە داهاتوو پاشەڕۆژو پێداویستیەکانیو ئەو ترسناکییانەی کە ڕووبەڕوی دەبێتەوە.

لە ڕوانگەی ئەم پێشەکییەوە، ئەو بنچینەو پێوەرانەی کە لە گەشەپێدانی ئابوریی وڵاتەکەماندا پێویستە ڕەچاوی بکەین، لەگەڵ زانینی ئەو ڕاستییەدا، کە ئێمە تەنها دەتوانین چەند تابلۆیەکی ڕێنماییو لابردنی چەند گابەردێكو لابردنی چەند دڕکێك لەو ڕێگا گرانو درێژەدا ئەنجام بدەین، لە بەشەکانی داهاتوودا دەیخەینە بەر دەستی خوێنەران.

# Incoterms® 2010

by the International Chamber of Commerce (ICC)

# زاراوەکانی بازرگانی نێودەوڵەتی

باسی ئەوەمان کرد کە زاراوەکانی بازرگانی نێودەوڵەتی (شروط التسليم) لە (INCOTERMS2010) دابەشکراوە بۆ (2) دوو گروپ کە لە (11) زاراوە پێکدێت:

**گرووپی یەکەمی زاراوەکان:** تایبەتن بە شێوازی گواستنەوەی مەوادو کاڵاو کەرەستەکان لە ڕێگای دەریاو ڕێگا ئاوییە ناوخۆییەکان، ئەمانەش لە (4) چوار زاراوە پێکدێن (FOB,CIF,CFR,FAS).

**گرووپی دووەمی زاراوەکان:** تایبەتن بە هەموو شێوازەکانی گواستنەوەی (دەریا، ئاسمان، وشکانی) ئەمانەش لە (7) حەوت زاراوە پێکدێن (EXW,FCA,CPT,CIP,DAT,DAP,DDP).

وە (تصنيف)ێکی تریشمان هەیە بۆ ئەم (11) زاراوەیە ئەویش دەکرێتە (4) گروپ:

**گرووپی یەکەم:** کۆمەڵەی (E) دەرچوون، وەکو (EXW).

**گرووپی دووەم:** کۆمەڵەی (F) پارەی گواستنەوەی سەرەکی (Main Carriage) نەدراوە، وەکو (FAS,FCA,FOB).

**گرووپی سێیەم:** کۆمەڵەی (C) پارەی گواستنەوەی سەرەکی (Main Carriage) دراوە، وەکو (CFR,CIF,CPT,CIP).

**گرووپی چوارەم:** کۆمەڵەی (D) گەیشتنن، وەکو (DAT,DAP,DDP).

## بەشی چوارەم

لە بەشی سێیەم باسی گرووپی یەکەممان کرد کە تەنها کۆمەڵەی (E) لە خۆ دەگرێت، ئەویش زاراوەی (EXW = EX WORKS)ەو بەرپرسیارێتی کریارو فرۆشیارمان خستە ڕوو لە کاتی کڕینی کاڵاو کەرەستەکان لە وڵاتی فرۆشیار تا دەگاتە کۆگاکانی کڕیار لە وڵاتی کڕیار.

لە بەشی چوارەمدا باسی گرووپی دووەم دەکەین: کۆمەڵەی (F) کە پارەی گواستنەوەی سەرەکی نەدراوە، وەکو (FAS,FCA,FOB).

ئەویش زاراوەی یەکەم وەردەگرین کە (FCA)یە، بزانین ئەم زاراوەیە لە بازرگانی نێودەوڵەتی چی دەگەیەنێت.



| FCA – FREE CARRIER (تسليم الناقل)<br>گەیاندنو تەسلیمکردنی دەست گەیەنەر، یان ئەو کۆمپانیایەی ئیشوکاری گواستنەوە دەکات | |
|---|---|
| **بەرپرسیارێتی کڕیار (Bayer)** | **بەرپرسیارێتی فرۆشیار (Seller)** |
| * پێویستە پارەی گواستنەوەی سەرەکی (Main Carriage) و گرێبەست بکاتو پارەکە بدات.<br>* دیاریکردنی ناوو شوێنی ئەو کۆمپانیایەی کە مەوادەکان دەگوازێتەوەو گرێبەستکردن لە گەڵیو بەرپرسیار دەبێت لە بارکردنو هێنانەوەی مەوادەکان تا وڵاتی خۆی هێنانە خوارەوەی بۆ ناو کۆگاکانی.<br>* بەرپرسیار دەبێت لە دانی پارەی بارکردنو گواستنەوە پاش دیاریکردنی شوێنی تەسلیمکردن.<br>* بەرپرسیار دەبێت لە دۆکیومێنتەکان.<br>* وەرگرتنی مەوادەکان لە شوێنی دیاریکراو، ڕادەستکردنی بۆ گواستنەوە، دڵنیاییکردنی مەوادەکان، ڕادەستکردنی مەوادەکان لە کاتی گەیشتنی وڵاتی خۆی، دانی گشت پارەی گومرکو باجو حازری دەکات بۆ وەرگرتنی مەوادەکان، بارکردنو گواستنەیو هێنانەخوارەوەی لەناو کۆگاکانی خۆی لە وڵاتی خۆی (کڕیار). | * ئامادەکردنی کەرەستەو کاڵاکان بۆ دەربازکردنو (تخليص)کردنی.<br>* بەرپەرس دەبێت لە گواستنەوەی (egairrac-erP) کە لە ناو وڵاتی خۆی دەکرێت.<br>* تەواوکردنی گشت مامەڵەکانی ناو وڵاتی خۆی بۆ هەناردنی مەوادەکان.<br>* تەسلیمکردنی مەوادەکان بە کۆمپانیای گواستنەوەی دیاریکراو لەلایەن کڕیارو لەشوێنی دیاریکراو، یان هەر کەسێکی تر کە کڕیار دیاری بکات بۆ وەرگرتنی مەوادەکان.<br>* تغليفکردن، بارکردن لەناو کۆگاکانی خۆی، گشت کارەکانی پێش تەسلیم کردن، دانی گشت پارەی گومرکو باجو حازری دەکات بۆ هەناردن (التصدير). |








everything is MARKETING



لە فارسییەوە:
حەمزە محەممەد کەریم

# ٨ ڕێگا بۆ برەودان بە کاری فرۆشتنو خزمەتگوزاریی پێویست

## گرنگترین ئەگەرو پێشهاتەکان، بەمەبەستی لە خۆگرتنی کڕیار

هەرچەنـــدە کاری فرۆشـــتنو خزمەتگـــوزاری، دوو چەمکـــی جیـــاوازن، بەڵام لەبنەڕەتدا دوو ڕووی دراوێکن، ئەو ئەزموونەی بە مەبەســـتی پیشاندانی خزمەتی پێویســـت، ئێمە پەیڕەوی دەکەین، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ هەمان ئەو ئەزموونانەی لە فرۆشتندا ئەنجامامان داون نییە.

ئەم هەشـــت ئەزموونەی کە باســـی لێوە دەکەین، بە بیروڕای ئێمە، بە بنەماکانی کاری فرۆشتن ئەژمار دەکرێن:

١- ســـەرنجی کڕیـــار بـــۆلای خـــۆت ڕابکێشـــە: ئێمـــە ناتوانین دان بەخۆمانـــدا بگرین، هەتـــا ئەو کاتەی بازاڕی ئـــازاد، لەڕێگەی تەلەفۆنـــەوە، هەمـــوو ئێوارانێـــك تەلەفۆنمان بۆ بـــکاتو لەبارەی شـــمەك، یـــان خزمەتگوزارییەکان ڕیـــکلام بکات، ئەمـــە وا دەکات بەشـــێوەیەکی ناچاری، ئێمە ژێربار بخـــات، ئێمەش بەوردی گوێی خۆمانـــی بۆ هەڵبخەین، کە ئەمەش لەڕاســـتیدا ڕێگەیەکی کاریگەر نییە؛ چونکە بەشـــێوەی زۆرەملێ، ناتوانیت ســـەرنجی کڕیار بۆلای خۆت ڕابکێشـــیت... ئەم جۆرە شـــێوازانە، لەشـــێوازەکانی (ویســـتی کڕیاران) نینو نیگەرانی دەکەن. یەکێك لە هەنگاوە سەرەتاییەکان، کە پێویســـتە لەبارەی فرۆشـــتنو خزمەتگوزارییەکانـــەوە بنرێت، ئەوەیە کە بەرەفتاری ئەرێنی، کڕیار ئاڕاستە بکەینو ڕەچاوکردنی ئەو مەرجانەی کە دیاری دەکات، بە هەند وەربگرین.

٢- داوای پێشـــنیارو پرســـیاری زۆر، لـــە کڕیار بکـــە: بنەمای ســـەرەکیی فرۆشتن، لەبەرچاوگرتنی ویســـتی کڕیارە، نەك ویستی خۆمان، ئەمەش لە ئەنجامی پرسیارکردنی زۆر بەرجەستە دەبێت، لەلایەن هەردوو لایەنەوە، چ کڕیار، یاخود فرۆشیار. ئەمانیش دوو جۆر شێوازی پرسیارکردن دەگرێتەوە، ئەوانیش:

* پرســـیاری کـــراوە: ئەم جۆرە بەمەبەســـتی پێدانی زانیاریی تەواوە، کە لە چوارچێوەی ویســـتی کڕیاردایە، بە مەرجی ڕاگرتنی هاوسەنگیی تەواو لە سوودگەیاندن بە کڕیار، سەبارەت بە کەلوپەلی فرۆشتن.

لە ڕێگەی پرسیاری کراوەوە، نموونەی (چۆن)، (بۆچی)، (کەی)، (کامە)، کە پێویســـتیان بە ڕوونکردنەوەی زیاترەو ناتوانرێت تەنها بە (بەڵێ)، یان (نەخێر) وەڵام بدرێنەوە.

* پرســـیاری داخراو: دەتوانن لەم پرسیارانە سوود وەربگریت، کە وەڵامەکەیان (بەڵێ)، یان (نەخێر) دەبێت، ئەم پرسیارانە کاتێك دەکرێت، کە ئامانج تێیدا بڕیاردان بێت لەسەر شمەکێك، نموونەی ئەم شـــێوازەش پرســـیارەکانی (ئایا ڕێککەوتین لەسەرئەوەی کە؟)، (ئایا تۆ دەتوانیت؟)، (ئایا بۆ جەنابتان گونجاوە کە؟).

٣- قســـەکردن لەبـــارەی ســـوودەکانی ئـــەو شـــمەکانەی کە بۆ فرۆشـــتنن: نرخـــی ئەو شـــمەکانەی کـــە دەیفرۆشـــیت، لەڕێگەی باســـکردنی ســـەرجەم ســـوودەکانی بۆ کڕیار، خزمەتگوزارییەکانت زیاتر بەرهەمدار دەکات، بەشـــێوەیەکی درووست ڕوونکردنەوە بدە، هەڵبەتە زیاد لە پێویســـت پێداگری لەســـەر نایابی بەرهەمەکانت مەکـــە، ڕەنگە ئـــەم پێداگرییە، بەلای خۆتـــەوە کارێکی باش بێت، بـــەڵام لەهەمان کاتدا، کڕیـــار زیاتر بیری لای ئەوەیە، کە تا چەند ئەو بەرهەمانە بازاڕی زیاتری دەبێت.

٤- کڕیـــار داوای هەرچـــی دەکات، زیاتر کار لەســـەر ئەوە بکە: دووبارەکردنـــەوەی ئـــەم گوتەیـــە، یان بـــە زیاتـــر گوێگرتن لێی، ڕاستەوخۆ کاری خۆی دەکات، بە گەڕانەوە بۆ داخوازییەکانی کڕیار، کـــە هەرچی لەناخیدایە، بەرجەســـتەی بکە، لـــەم ڕێگەیەوە ئیدی کڕیار ئەو هەســـتەی بۆ درووســـت دەبێت، کە تۆی فرۆشیار گرنگی پێدەدەیت، نەك تەنها بە مەبەســـتی کارەکەی خۆت، بەڵکو نرخ بۆ خواستەکانی دادەنێیت.

٥- لەگەڵ شێوازی کارکردنی کڕیار هەماهەنگی بکە: دەربڕینی هاوســـۆزی لەبارەی شـــێوازی کارکردنـــی کڕیـــارو لەبەرچاوگرتنی داخوازییەکانـــی، لێـــرەدا مەبەســـت لـــە نمایشـــکردنی ســـەرجەم شـــمەکەکانە، بەشـــێوەیەك کە زۆرترین زانیـــاری بدرێت بە کڕیار، بتانەوێـــت بەتـــەواوی بەخواســـتی تۆ بێـــت، ئەمە نابێـــت. لێرەدا باشـــترین ڕێگەکانی چارەســـەر، بـــۆ هەریەك لەم شـــێوازانەی کە باسکران دەخەینەڕوو:

* کڕین بە شێوازی شیکردنەوەی حاڵەتەکان: کڕیاران ئەمە بە ڕێگەچارەیەکی هەنوکەیی ئەژمار دەکەن، نەك لایەنی هەستو سۆز. بڕیاردان لەم شـــێوازەدا، زیاتر کڕیار پشت بە ژیری دەبەستێت، بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کڕیارانی ئەم شێوازە پێویستە:

أ- زانیاریی تەواو بەشێوەی نووسراو لەلات هەبێت.

ب- لەبارەی کوالێتیی کاڵاکانت، پێویستە زانیاریی تەواو لەڕووی سەرچاوە، درووستی، یان ساختەیی کاڵاکان پیشانی کڕیار بدە.

ج- لەبارەی نمایشکردنو ناساندنی کاڵاکان، پیشەییانە ڕەفتار بکە.

* **کڕین بە شێوازی هاندان:** کڕیارانی ئەم شێوازەی کڕین، هەمیشە بەدوای بەرهەمێکدا وێڵن، کە ئەنجامێکی خێرایان دەست بکەوێت، ئەو کەسانەی پەیوەستن بەم شێوازەوە، بڕیاری خێرای تایبەت بە خۆیان دەدەن، ئەمانە کاتێك تایبەت بە شتێك بڕیار دەدەن، لەکاتی درووستبوونی هەرکێشەیەکدا، گۆڕان بەسەر بڕیارەکەیاندا دەهێنن، مامەڵەکردنیش لەگەڵ کڕیارانی ئەم شێوازە، بەم جۆرە دەبێت:

١- مۆڵەتیان پێ بدە؛ تا دەرکی ئەوە بکەن، کە لەبارەی کڕینو فرۆشتن، خاوەنی ئیرادەیەکی بەهێزن.

٢- کارێکی وەها بکە، کە کڕینی شمەکەکانت، کارێکی ئاسان بێت لەلایەن کڕیارەوە.

٣- دڵنیایی تەواو بە کڕیار بدە، لەدوای فرۆشتنی هەرشتێك، هەر کەموکورتییەك لە شمەکی فرۆشراودا ڕووی دا، ئەوا جێگای بایەخ نییە، بەکورتی: فرۆشراو وەرناگیرێتەوە.

٤- ئەوە پیشانی کڕیار بدە، کە بەرهەمەکانت بە چ جۆرێك یارمەتیی کڕیار دەدات؛ تا بە ئامانجەکەی بگات.

* **کڕین بە شێوازی ڕوونکردنەوەی پێویست:** کڕیارانی ئەم شێوازە، زیاتر لە هەموو شێوازەکانی دیکە، پێویستیان بە یارمەتییە، ئەو کەسانەی ئەم شێوازە پەیڕەو دەکەن، لەسەر بنەمای ڕێژەیەکی بێوێنە، خزمەتگوزارییەکانت کاریگەری ئەرێنییان لەسەر جێ دەهێڵێت. کۆمەڵێك خاڵی گرنگ هەن، کە پێویستە لەم شێوازەدا ڕەچاو بکرێن:

١- بەدەمەوەچوونت لەگەڵ کڕیار بەشێوەیەکی جوانو شادیبەخش بێت بۆیان.

٢- دڵنیایی تەواوی پێ بدە، کە گرنگی بە هەموو لایەنێك دەدەیت.

٣- بەدواداچوونی ئەوان بۆ کەلوپەلەکان پێویستە بەدڵی خۆیان بێت.

* **کڕین بەشێوازی هەماهەنگی:** کڕیارانی ئەم شێوازە، لە هەموو شێوازەکانی دیکە هەستیارترن. شێوازی بڕیاردانیان لەسەر هەر شتێك، زیاتر درێژە دەکێشێتو پەیوەستە بەو پێوەرەی کە تا چ ڕادەیەك لەگەڵ کڕیارو شتومەکەکان، هەست بەخۆشی دەکەن. کۆمەڵێك خاڵی گرنگ هەن، کە پێویستە لەم شێوازەدا ڕەچاو بکرێن:

١- لە بڕیاردان پەلەیان لێ مەکە، کاتی پێویستیان پێ بدە؛ هەتا بڕیاری گونجاو بدەن.

٢- وەکو هاوڕێی پیشەیی، لەگەڵ کڕیاردا ڕەفتار بکە.

٣- لە هەنگاوی ناساندنی کاڵاکانتو دوای فرۆشتن، پرسیار لە کڕیارەکان بکە؛ تا تێ بگەن کە هەستی ئەوان لەبارەی داواکاریی پێشنیارکراو چییە.

**٦- ئەو کارانەی لەکاتی کڕیندا لەلای کڕیار گرنگن:**

ئەو پێشهاتانەی کە جێگەی سەرنجی کڕیارن، ئەو هۆکارانەی دەبن بەهۆی بڕیاردانی کڕیار لەسەر شمەکەکانت، یان خزمەتگوزارییەکانت کامانەن؟ ئەو پێوەرانە کامانەن، لەکاتی بڕیارداندا، کاریگەریی تەواویان لەسەر کڕیار هەیە؟ دەتوانیت بە پێنج پێوەری سەرەکی، کڕیارەکان ڕابهێنیت؛ تا بەوردی پرسیار بکەنو بەوردیش گوێ بگرە. بەرنامەی ناساندنی شمەکەکانت بەم پێنج پێوەرە ڕێك بخە.

بۆ نموونە: ئەگەر ویستت سەلاجەیەك بفرۆشیت، دەکرێت لە گفتوگۆی سەرەتادا، لەگەڵ کڕیار لەیەکدی تێ بگەن، لەسەر کۆمەڵە شتێکی گرنگ، وەك: گرەنتی، ڕەنگ، قەبارەی سەلاجەکەو گۆڕینەوە بەخۆڕایی، ئەمە زۆرترین کاریگەری دەبێت لەسەر کڕینی سەلاجەکە، بە زانینی ئەم ڕێنماییانە، دەتوانیت ئەم هۆکارانە لەبەرچاو بگریت، ئیدی بە پێشنیارکردنی هەرچی کە جێی سەرنجی کڕیار نین، ئیدی کاتی خۆت بەفیڕۆ مەدە.

ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنانەی کە بەمەبەستی وەرگرتنی زانیاری بۆت دێت، بیگۆڕە بە شێوازی ماڵپەڕی تایبەت بە فرۆشتن. ئەگەر کڕیار تەلەفۆن بکات بۆ بەشی خزمەتگوزارییەکانت، هەر داواکارییەك، یان پێشنیارێکیان هەبوو، ئامادەییت تێدابێت؛ تا بتوانن زانیاری لەبارەی بابەتی پەیوەندیدار بەتەواوی خزماتگوزارییەکانی کۆمپانیاکەت پیشانی کڕیار بدەیت. کاتێك پانتاییەکی زۆر لە کارەکەت لەدەست دەدەیت، کە بەرپرسانی خزمەتگوزارییەکەت وەك پێویست کارەکانیان پیشان نادەن، لە کڕیار ناپرسن کە ئایا بە هیچ یەکێك لەو زانیارییانەی پیشانی کڕیار دەدرێت پەیوەندی هەیە، یان نا؟

مامەڵەو کاری خۆت، بەشێوەیەك ڕێك بخە، کە بتوانیت سەراپای خزمەتگوزاریو کاڵاکانت بە کڕیار بفرۆشیت.

**٧- ئاگاداری وەڵامی (نا) بن:** ئەم بیرۆکەیە (کە هەرگیز وەڵامی (نا) پەسەند نەکەیت، هێندە پرسیار بکە، هەتا وەڵامی (بەڵێ) ببیستیت). ئیدی ئەم وەڵامە بەسەرچووەو کۆن بووەو بەم شێوەیە (ویستی کڕیار) بەدی نایەت. ئەگەر لەبارەی کاڵاو شمەکەکانت لەگەڵ کڕیارەکاندا قسەت کرد، وەڵامی ئەوان (نا)یەکی توند بوو، ئەمە مانای ئەوەیە، کە ئەوان تا ئێستا، هیچ هۆشیارییەکیان لەکاری کڕین نییە. سەرەڕای هەموو ئەمانەش، گوێ بۆ قسەکانیان هەڵبخە، وەڵامی (نا)ی ئەوان بە لەخۆبوردەیی خۆت پەسەند بکە، دەکرێت ئەمڕۆ فرۆشی تۆ، وەك پێویست نەبێت، بەڵام لە داهاتوودا، دەتوانیت بەرهەمەکانت بەخودی خۆیان، یان کەسانی هاوشێوەی ئەوان بفرۆشیت.

**٨-: پەیوەندیت لەگەڵ کڕیار بە سنگێکی فراوان قبوڵ بکە:**

کاتێك کە کڕیار لەبارەی خواستەکانی خۆی دەدوێت، کە پێت دەڵێت: بۆچی لە کڕینی شتومەکەکانت دڵنیا نییە، دۆش دامەمێنەو لەئاست قسەکانیان خۆت بێئاگا مەکە، خەڵك هەتا لەکاتی نارەحەتییەکاندا، لەبارەی ویستو داواکارییەکانی خۆیان نەدوێنو دڵنیا نەبنو وشەی (بەڵێ) نەڵێیت، نابنە کڕیاری شمەکەکانت. باشترین ڕێگەش ئەمەیە، کە بەشێوەیەکی ڕاستگۆ پەی بە سەرلەبەری نارەحەتییەکانی کڕیار ببەیتو بەدواداچوونی بۆ بکەیت. بەم شێوەیەش وردە وردە بۆت دەردەکەوێت، کە ئەوکاتەی کە بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە تەرخانی دەکەیت، دەبێت بە جێی بایەخی زیاتری کڕیار بە تۆو بەرهەمەکانت.

سەرچاوە: مجلە (موفقيت). ژمارە (٣٠٠).

# شێری چاولەدەست!

بڕیاری منداڵان

و. بەدەستکارییەوە:
محەممەد مێرگەیی

بەزۆری شـێر بە پاشـای دارسـتان ناودەبرێـت، بەڵام هەڵسـوکەوتی ئەم شـێرە جودایەو زۆر حەزی لە تەمەڵی دەکـرد، گرنگی بە ڕاوکـردن نەدەدا، دەیویسـت گیاندارنی دیکـە خواردنی بۆ بهێننە ناو ئەو ئەشـکەوتەی لێی دەژیا. هەربۆیـەش ڕۆژێکیـان گەلـەك دڵی خۆشـبوو بـەو درکە گـەورەی لە پێی چەقیبوو! چونکە ئەمە بەهانەی پێدابوو؛ بۆئـەوەی لـە ئەشـکەوت بمێنێتەوەو هیـچ کارێك ئەنجام نەدات، هەروەها لەبەرامبەر ئاژەڵاندا بە شەلەشەل دەڕۆیی؛ بۆئەوەی ئەوان هەستی بەزەییان ببزوێتو لەباتی ئەو ڕاوی بۆ بکەن!

ئەوەبوو هەندێك لە ئاژەڵان پێشنیاری ئەوەیان کرد، ئەو درکە لە پێی شـێر دەربهێنن، بەڵام شـێر بەمە ڕازی نەبوو، لەبەرئەوەی دەیویسـت هەر لەسـەر ئەو عـوزرو بەهانەی بمێنێتەوە. بەم شێوەیە شێر لە ئەشکەوتەکەی مایەوەو هەر چاوەڕێی گیاندارانی دیکەی دەکرد؛ تا خواردنی بۆ بهێنن.

ڕۆژێکیان شـێر بەخۆی گوت: مـادام دەتوانم خواردنو خـۆراك بخـۆم، ئـەی بۆچی ئـەو ئاژەڵانەش نەخـۆم، کە خواردنم بۆ دەهێنن؟

هەر ئەوەشی ئەنجام دا، ئەوەبوو کاتێك ئاژەڵێك خواردنی بۆ دەهێنا، یانیش دەهاتە دەرگای ئەشـکەوتەکەو پرسیاری تەندرووستی لێدەکرد، لەو دەمەدا شێر داوای لێدەکرد بچێتە ژوورەوە، بەمەش ئەو ڕۆژە دەبووە دوایین ڕۆژی ژیانی ئەو ئاژەڵە بەستەزمانە! هیچ یەکێ لە ئاژەڵان گومانیان لە شێر نەدەکرد، بۆ چەند هەفتەیەك شـێر زۆر بەباشی دەیخوارد، تاوەکو ڕۆژێکیان ڕێوی هاتە لای شێر، دیارە ڕێویش لە شێر زۆر زانترەو لە هەموو ئاژەڵانی دیکەش بەسەرنجترە. کاتێك ڕێوی گەیشـتە بەر دەرگەی ئەشکەوت، بەوردی تەماشایەکی دەوروبەری کردو ئینجا گوتی: بەیانیت باش هاوڕێ، ئەمڕۆ حاڵی پێیەکەت چۆنە؟

شـێر وەڵامی دایەوەو گوتی: وەڵـڵا ڕێویی هاوڕێم هیچ بـاش نیمو دەمەوێت بزانم تۆ ڕات چۆنە لەبارەیەوە؟ وەرە ژوورەوەو پێم بڵێ، بزانم چۆنی تێدەگەیت.

بەڵام ڕێوی لەو دەمەدا سـەرقاڵی پشـکنینی شـوێنەکە بووو وەڵامی نەدایەوە.

شێر گوتی: برادەر لە دەرەوە مەمێنەوە، وەرە ئێرە؛ بەر ئەو سێبەرە فێنکە.

ڕێوی گوتی: من دەمەوێت بێمە ژوورەوە، بەڵام شـتێکی نامـۆ هەیە لە ڕێڕەوی ئەشـکەوتەکەی تۆ، کە سـەرم لێی سوڕماوە! ئەم ڕێچکەیە پڕیەتی لە شوێنپێی دیکە.

شـێرەکە گوتی: هاوڕێ هیچ شـتێکی نامۆ لەوەدا نییە، ڕۆژانە میوانێکی زۆر سەردانم دەکەن.

ڕێـوی گوتی: بەڵـێ ئـەوە دەزانم، بەڵام ئـەوەی منی سەراسـیمە کردووە، ئەوەیە کە گشت شـوێنپێیەکان بەرەو ئاراسـتەی ناو ئەشکەوتەکە هاتوون، کەچی یەك شوێنپێش بەرەو دەرەوەی ئەشکەوت نابینم!

شێر کەمێك دەمی لێکردەوەو ئینجا دای خستەوە، بەڵام نەیتوانی بیر لە شتێك بکاتەوەو بە ڕێوی بڵێت.

ڕێویش هەر زوو لەوێ دوور کەوتەوەو حیکایەتی شوێن پێیەکانیشـی بە سەرجەم ئاژەڵانی دارستانی ڕاگەیاند، بۆیە دوای ئەمە هیچ یەکێك سـەردانی شـێری نەکرد، درکەکەی پێشـی بە تەواوی ئازاری دەداو ئەمجارە بەڕاسـتی دەشەلی نەوەك هەر بە ڕواڵەت وەك کە جاران خۆی پیشان دەدا. شێر هیـچ توانای بازدانو ڕاوکردنی نەمابـوو، بۆ یەکەمجاریش بوو هەسـتی بە برسـێتی کرد، بەڵام بەبـێ ئەوەی یەکێك هەبێت، بایەخی پێبداتو لێی بترسێت!





ڕۆشنبیری تەندروستی!



# شێرپەنجە
# Cancer

### ١.ناساندنی نەخۆشییەکە:

شێرپەنجە یەکێکە لەسەرەکیتریین هۆکارەکانی مردن لە سەرتاسەری جیهاندا، ئەمەش بەهۆی گۆڕانی شێوازی ژیان لە مرۆڤدا، بەجۆرێك زۆربەی گۆڕانەکان خزمەت بە تەندرووستیی مرۆڤ ناکەن، کەوابوو مەترسییەکانی شێرپەنجە، ڕۆژ بەڕۆژ لە زیادبووندایە.

سالانە دەبێت بەهۆی کوشتنی ٧،٤ ملیۆن کەس، بەناوبانگترین جۆرەکانی شێرپەنجە (بەپێی بڵاوی‌و زیادی ڕێژەی مردن):

١. شێرپەنجەی سییەکان: دەبێت بەهۆی مردنی ١،٣ ملیۆن کەس لە ساڵێکدا.

٢. شێرپەنجەی گەدە: دەبێت بەهۆی مردنی ٨٠٣ هەزار کەس لە ساڵێکدا.

٣. شێرپەنجەی کۆڵۆن‌و ڕێکە دەبێتە هۆی مردنی: ٦٣٩ هەزار کەس لەساڵێکدا.

٤. شێرپەنجەی جگەر: دەبێت بەهۆی مردنی ٦١٠ هەزار کەس لە ساڵێکدا.

٥. شێرپەنجەی مەمك: دەبێت بەهۆی مردنی ٥١٩ هەزار کەس لە ساڵێکدا.

لە جیهاندا زیاد لە ١٠٠ جۆر شێرپەنجە هەیە، ڕێژەی تووشبوون لە وڵاتە پێشکەوتووەکان زیاترە (بەشێوەیەك لە سێ کەس یەکیان تووش دەبێت لە ژیانیدا)، بەڵام ڕێژەی مردن بە شێرپەنجە لەوڵاتە دواکەوتوو هەژارەکاندا زیاترە.

شێرپەنجە: بریتییە لە: زۆربوون‌و هەندێجار بڵاوبوونەوەی نائاسایی هەندێك لەخانەکانی لەش، بەهۆی ڕوودانی بازدانی بۆماوەیی لە بۆماوە ماددەی ئەو خانانەی کە گەشەی خانەکان ڕێك دەخەن، هەموو خانەیەك لەلەشدا ئەگەری تووشبوونی بە شێرپەنجە هەیە، بەڵام زیاتر لەو خانانەدا دەبێت، کە توانای دابەشبوون‌و زۆربوونیان زیاترە لەخانەکانی دی.

#### جۆرەکانی شێرپەنجە:

* شێرپەنجەی ناکوشندە( benign): ئەو جۆرەیە کەتەنها گەورەبوون، یان گۆڕانێکی کەم لەشانەکاندا ڕوودەدەن‌و توانای بڵاوبوونەوەیان نییە‌و چارەسەری ئاسانە، ٩٠ _ ٩٥ ٪ی بارەکانی شێرپەنجە لەم جۆرەن، گەر چارەسەر نەکرێت، ڕەنگە سەر بکێشێت بۆ شێرپەنجەی کوشندە.

* شێرپەنجەی کوشندە ( malignant): ئەم جۆرە مەترسی زیاترە، بەهۆی بەردەوامی لەتەشەنەکردن‌و بڵاوبوونەوەی خانەکان، چارەسەری گرانترە، بەتایبەت ئەگەر درەنگ دەستنیشان بکرێت‌و چارەسەر بکرێت.

### ٢.هۆکارو ڕێخۆشکەرەکانی شێرپەنجە:

* خۆراکی ناتەندرووست: خۆراك بەیەکەمین‌و سەرەکیتریین هۆکارەکان دادەنرێت‌و ٧٠٪ ی شێرپەنجە بەهۆی خۆراکەوەیە، بەتایبەت خۆراکی زۆر چەور، لەقوتوونراو، خۆراکی ناسرووشتیی‌و ئەوانەی ماددەی کیمیاییان تێدەکرێت، دوورکەوتنەوە لە دانەوێڵە‌و سەوزە‌و میوەی سرووشتیی.

* کێشانی جگەرە، یان نێرگەلە: بە دووەم هۆکاری شێرپەنجە دادەنرێت، نزیکەی ٣٠٪ شێرپەنجە بەهۆی جگەرەوەیە، زیادترین هۆکاری مردنە بە شێرپەنجە. هۆکاری زۆرێك لەجۆرەکانی شێرپەنجەیە.

* خواردنەوە کهوولییەکان: پەیوەندییەکی بەهێزی هەیە لەگەڵ شێرپەنجەی (دەم، سورێنچك، جگەر، مەمك، کۆڵۆن، ڕێکە، ..هتد).

* پیسبوونی ژینگە.

* زۆر بەرکەوتنی تیشکی خۆری بەهێز: بەتایبەت دەوروبەری نیوەڕوان بۆ ماوەیەکی زۆر، ئەگەری شێرپەنجەی پێست زیاد دەکات.

* بەرکەوتنی تیشکە زیانبەخشەکان: (بەویستی خودا لەداهاتوودا باسی دەکەین).

* قەڵەویی.

* وردەزیندەوەرەکان: تووشبوونی درێژخایەن بەهەندێك ڤایرۆسی وەك ( HBV، HCV، EBV، HPV، HIV)و بەکتریای وەك (helicobacter pylori).

* وەرگرتنی هۆرمۆنەکان، دەرمانی دژە سکپڕی.

### ٣. ئایا دەتوانین خۆمان بپارێزین لە شێرپەنجە؟

وەڵامەکەی (بەڵێ)یە! لەسێ کەس یەکیان تەنها بەگۆڕینی شێوازی ژیان‌و پەیڕەوکردنی سیستمێکی تەندرووست دەتوانێت خۆی بپارێزێت، لە سێ تووشبوو یەکیان دەتوانرێت چارەسەر بکرێت، بەمەرجێك لەقۆناغەکانی سەرەتادا پێی بزانرێت‌و چارەسەری گونجاوی بۆبکرێت.

### ٤. چۆن خۆمان بپارێزیین؟

* واز لە جگەرەکێشان بهێنە، (ئێستا لە سبەی باشترە).

* واز لە خواردنەوەی کهوول بهێنە.

* خواردنی دانەوێڵە (بێ لێکردنەوەی توێکڵەکەی، واتە: کەپەکی لێ جیامەکەرەوە)و دوورکەوتنەوە لەئاردی سپیی (سفر).

* خواردنی سەوزە‌و میوە بەتوێکڵ‌و ڕیشاڵەکانییەوە (نەك بەشێوەی شەربەت)، کاریگەریی ئەرێنی لەسەر ڕێگریکردن لە زۆرێك لە شێرپەنجەکان هەیە.

* کەمکردنەوەی خوێ بۆ کەمتر لە (٥ گم /ڕۆژانە)، تا بکرێت کەمترین بڕ بەکار بهێنە‌و مەیکە بەسەر خواردنداو لەسەر مێزی خواردن دایمەنێ، دوورکەوتنەوە لەو خۆراکانەی خوێیان زۆر پێوەیە.

* ئەنجامدانی وەرزش: لانی کەم ٣٠ خولەك لە ڕۆژێکدا، یان ٣،٥ کم ڕاکردن.

* ڕێگریکردن لە قەڵەویی‌و پارێزگاریکردن لەکێشێکی تەندرووست.

* کەمکردنەوەی گۆشتی سور، زیاتر بەکارهێنانی گۆشتی ماسی، یان مریشك.

* وەرگرتنی کوتان ( vaccine) بۆ ڤایرۆسی جگەر جۆری B.

* ئافرەتان پێویستە لە ٢٠ ساڵی بەرەو سەرەوە پشکنین بۆ مەمکیان ئەنجام بدەن، بەسەردانکردنی سەنتەری مەمك، ڕاهێنانیان لەسەر ئەوەی خۆشیان لەماڵەوە پشکنین بۆخۆیان بکەن.

* هەر شتێکی نامۆت لەخۆتدا بەدی کرد، سەردانی پزیشك بکە.

* هەرکەسێك لەخێزانەکەتان، یان لەمێژووی خزم‌و کەسەکانتاندا هەر شێرپەنجەیەکی هەبووبێت، واباشە تۆش پشکنین بۆ ئەو جۆرە شێرپەنجەیە بکەیت.

پەروەردگار هەموو لایەك بپارێزێت...

ن: د. حسان شمسی پاشا و: یەحیا محەمەد عەلی

# کوولەکەو سوودەکانی



کوولەکە دیارترینو گرنگترینی ئەو بەرهەمە رووەکییانەیە، کە زۆر بەسوودە بۆ تەندرووستیی لەش، بەهۆی بوونی ناوێتە خۆراکییە بەسوودەکان تێیدا، وەك: ڤیتامینو کانزاو ڕیشاڵو دژەئۆکسانەکان.

| بەهای خۆراکی لە (لە ١٠٠ گم) کوولەکەدا | |
|---|---|
| ڕیشاڵە خۆراکییەکان | ١گم |
| پرۆتین | ١گم |
| ڤیتامین (A) | ٪٤ ی پێویستی ڕۆژانە |
| ڤیتامین (C) | ٪٢٨ ی پێویستی ڕۆژانە |
| پۆتاسیۆم | ٪٧ ی پێویستی ڕۆژانە |
| مەنگەنیز | ٪٩ ی پێویستی ڕۆژانە |

## سوودەکانی کولەکە:

**یەکەم:** پاراستن لە نەخۆشییەکانی دڵ:

یەکێك لە دیارترین سوودەکانی کوولەکە، بوونی بڕێکی زۆری ئاوێتە بەسوودەکانە بۆ دڵ، وەك مەگنیسیۆمو خوێی ترشی فۆلیك، هەروەها ئەو ڕیشاڵانەی تێدایە، کە کۆلیسترۆڵو پۆتاسیۆمی کەم دەکەنەوەو دەبن بەهۆی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.

**دووەم:** پاراستن لە نەخۆشییەکانی شێرپەنجە:

بوونی بڕێکی زۆری ڕیشاڵەکان لە کوولەکەدا، لەش لە شێرپەنجەی کۆڵۆن دەپارێزێت، هەروەها دەوڵەمەندە بە دژەئۆکسینەکان لەش لە جۆرەکانی شێرپەنجە دەپارێزێت.

**سێیەم:** یارمەتیی دابەزاندنی کێش دەدات:

کوولەکە یارمەتیی ڕێجیمو کێش دابەزاندن دەدات؛ چونکە بڕێکی کەمی گەرمۆکەی تێدایەو لە هەمان کاتیشدا، بۆ ماوەیەکی زۆر هەست بە تێربوون دەکرێت بەهۆی بوونی ڕیشاڵ، سەرەڕای ئەوە، بەهۆی بوونی کاربۆهیدراتەوە، لەش بە چالاکی دەهێڵێتەوە.

**چوارەم:** بەسوودە بۆ نەخۆشیی شەکرە:

بوونی ڕێژەیەکی بەرزی ڤیتامینو توتیاو مەگنیسیۆم تێیدا، زۆر سوودبەخشن بۆ ڕێکخستنی ئاستی شەکر لە خوێندا.

**پێنجەم:** باشکردنی تەندرووستیی چاو:

کوولەکە دەوڵەمەندە بە ڤیتامین (A) ئەویش ڕۆڵێکی گەورەی لە پاراستنی نەخۆشییەکانی چاو هەیە، هەروەها ڤیتامین (C)و بێتاکارۆتینو توتیاو مەگنیسیۆم ئەم توخمانە ڕۆڵی دژە ئۆکسینەکان دەبینو چاو لە نەخۆشییەکان دەپارێزن.

**شەشەم:** پاراستن لە فشاری بەرزی خوێن:

کوولەکە بڕێکی زۆرباش پۆتاسیۆمو مەگنیسیۆمی تێدایە، ڕۆڵێکی گەورە دەبینن لە ڕێگەگرتن لە بەرزبوونەوەی فشاری خوێنو پاشانیش پاراستنی لە نەخۆشییەکانی دڵ.

**حەوتەم:** باشکردنی تەندرووستیی پێست:-

کوولەکە دەوڵەمەندە بەو ڤیتامینو کانزاو دژەئۆکسینانەی کە ڕۆڵیان هەیە لە باشکردنی تەندرووستیی پێستدا، لە گرنگترین سوودەکانی، پاراستنی پێستە لە چرچبوونو ڕەنگرتنییەتی لە وشکبوون.

**هەشتەم:** بەهێزکردنی قژ:-

بەکارهێنانی کوولەکە لە ژەمەخۆراکییەکاندا، بەهۆی ڤیتامینو کانزاکانەوە، ڕۆڵێکی گەورەی لە بەهێزکردنی قژو زیاد گەشەکردنی.

**نۆیەم:** کەمکردنەوەی کۆلیسترۆڵ:-

بوونی ڕیشاڵی خۆراکی لە کوولەکەدا یارمەتیی ڕێگرتن لە مژینی کۆلیسترۆڵ دەدات، پاشانیش ڕێژەی کۆلیسترۆڵ لە خوێندا کەم دەبێتەوە.

**دەیەم:** باشکردنی تەندرووستیی پیاوان:-

هەندێك لە لێکۆڵینەوەکان جەخت لەوە دەکەنەوە، کوولەکە سوودی هەیە بۆ باشکردنی کارەکانی پرۆستاتو بەهێزکردنی لایەنی جنسیی پیاوان.

سەرچاوە: سایتی فوائد

# «بڕێکیش لە خۆشی»

و: ئاسیا صەلاح

سەرەڕای ئەوەی نەتەوەکەمان پێویستی بە کاتو جدیات هەیە، لە پێناو ڕاستکردنەوەی هەندێك لەو شتانەی لەدەستی چووە لەسەر ئاستی پێشکەوتنی شارستانی، گرنگیشە خۆمان بپارێزین لەو جدییەتە دەبەنگانەیەی کەوا دەکەن مرۆڤ هاوشێوەی بێبەشو دەردەسەران بێت، چی ڕێگرە لەبەردەم کەسێکدا هەوڵێکی لە ڕادەبەدەر دەدات؛ تا بگاتە لوتکەی چیا کە چێژ لەو دیمەنە سەرسوڕهێنەرانەی دێنە سەر ڕێگەکەی، ببینێت؟ چی ڕێگرە لەبەردەم ڕاوچییەکدا، کاتێك دەچێت بۆ پەیداکردنی قووتی ڕۆژەکەی کە زیکری خودا بکاتو شادمان بێت بە ڕوانین لە شەپۆلی دەریای هێمن؟ تۆزقاڵێك لە پێکەنینو منداڵبوونەوەو نیگایەك... چێژێکی دی دەدات بە ژیان، هەندێك لە قورساییەکان لەسەر ڕۆح سووك دەکات. پێشەوامان دروودی خودای لێ بێت، لەوپەڕی ڕێزداریو مەزنیو ترسان لە خودای گەورەو ئاوات بەرزیدا بووە، هێشتا گاڵتەی لەگەڵ هاوەڵانی دەکرد، دەهاتە پێکەنین بە شتانێك کە ئەوانیش پێی پێدەکەنن، سەرسام دەبوو بەوەی ئەوانیش پێی سەرسامن، هەر بۆیەش دەفەرمووێت: " هیچ چاکەیەك بەکەم مەزانە، ئەگەر تەنها زەردەخەنەیەکیش بێت بەڕووی براکەتدا ". عەبدوڵڵای کوڕی حارس "ڕەزای خودای لێ بێت" دەڵێت: "هیچ کەسێکم نەدیوە لە پێغەمبەر زیاتر زەردەخەی کردبێت". لەگەڵ هەواڵی خۆشدا کاردانەوەی هەبوو، ڕووی دەگەشایەوە، یەکێك لە هاوەڵانی دەڵێت: "کاتێك پێشەوامان دڵخۆش دەبوو، ڕووی دەبریسکایەوە دەتگوت پارچەیەکە لە مانگ، هەموومان ئەمەمان دەزانی" . هەوڵ بدەن لە دڵەوە پێبکەننو خۆشی ببینن لە ڕێگەی یارییەکەوە بێتو گاڵتەیەك بێت، یان وەرزشێك، بەرەنگاری بێزاری ببنەوە؛ چونکە دوژمنی خۆشبەختییە؛ با ئەمانە هەمووی لە سنووری شەریعەتی ئیسلامدا بێتو لە سنوورێکی مامناوەندا بێت. هەروەك چۆن سەیارەیەك پێویستی بە وزەیەکە تاکو بجووڵێتو بڕوات، گەشبینیو ئاسوودەییو هیواو چێژ بینینو تێبینی خۆشی ئامێز، ڕۆڵی سەرەکی دەبینن لە فەراهەمکردنی ئەو وزەیە.

**ئەمە لای کوڕو کچەکانم، چی دەگەیەنێت؟**

١- بەربەستێکی سەلامەتی لە پێکەنین درووست بکەن بەرامبەر دوودڵیو خەمۆکی، بیکەن بە هۆکارێك بۆ پاراستنی تەندرووستیی ئەقڵو ناخ، وەك یەکێك لە شارەزایان دەڵێت: ناتوانیت پێکەنینو خەمۆکی پێکەوە کۆ بکەیتەوە، بەڵام بیرتان بێت، لەمەداو لەهەموو شتێکی دیکەدا، هاوسەنگیتان بیرنەچێت.

٢- ڕووگەشی، کاریگەری دەخاتە سەر قووڵایی ڕۆح، کاتێك مرۆڤ لە ناخەوە پێدەکەنێت، چاوەکانی پڕ دەبن لە فرمێسك لە سوپاسگوزاریدا بۆ ئەو کەسەی هۆکاربووە.

٣- پێکەنین لە منداڵە بچووکەکان فێربن، بە سانایی پێدەکەنن، بە هەر شتێکیش بێت، ئێوەش دەتوانن وەها بکەن گەر بە شێوازی ئەوان بیر بکەنەوەو خەون بە خەونەکانی بە خۆشبەختیو پێکەنینو قسەی خۆش دوور بکەوەرەوە لە لوتبەرزیو خەڵك بە سووك سەیرکردن، هەروەها لە کەسێتیی دەستکردو پڕوپاگەندەی هەڵەو ڕۆح وشکی.

٤- مرۆڤ بەبێ خۆشبەختی، چواندوویانە بە ئۆتۆمۆبیلێك بەبێ هیچ یارمەتیدەرێك، کە لەگەڵ بەیەکگەیشتنی هەر کەلێنێك دەلەرزێتو لێی دەدات. هەوڵی ڕووبەڕووبوونەوەی قورساییەکانی ژیانو ئازارەکانی بدەن لە ڕێگەی پشتبەستن بە یارمەتیی خودای گەورەو پاداشتەکانی لەڕێگەی بینینی ڕووی جوانی شتەکان.

٥- لەگەڵ ناسیاوو هاوڕێیانتدا لەبارەی چەند چیرۆکێك بدوێ، کە بەسەرتان هاتووەو ئێستا پێکەنینتان پێی دێت، خەڵکی ئەم جۆرە مرۆڤانەیان خۆش دەوێت. هەمیشە هەوڵ بدەن لەگەڵ چواردەوردا پێبکەنن، نەك پێیان پێ بکەنن، لە هەموو ئەوانەشدا، ئاگاداری درۆو بوختان بە.

٦- دڵخۆش بن بە گوێڕایەڵیو دەستکەوتو بەیەکگەیشتن لەگەڵ خزمانو هاوڕێیاندا، هەمیشەو هەردەم سوپاسگوزاری خودابن.

هەرکات ڕێزی بەرامبەرەکەمان دەگرین، ئەوە بەدڵنیاییەوە ڕێزی خۆمان دەگرین، زۆرکات بە نواندنی هەڵوێستێکی سادە، کە هیچ بەهایەکمان بۆ دانەناوە، بەبێئەوەی ئاگاداربیت، گەورەترین کاریگەریت لەسەر کەسی بەرامبەر بەجێهێشتووە، چ بەباش، یان بەخراپ.. هەروەها پێویستە بەچاوی ڕێزو حورمەتەوە، بۆ بەرامبەرەکەمان بڕوانین، بەبێ جیاوازیکردن ئەمە ڕەشە، یان سپییە. یان جیاوازیی نەتەوەو زمان، یان جیاوازیی بیروباوەڕ.. نابێت بەهۆی ڕوانین بۆ پۆشاکو ڕواڵەتی مرۆڤەکانەوە، مرۆڤ بوونی مرۆڤەکانمان لەبیر بچێتەوە؛ چونکە لەوانەیە لە نێو ئەو پۆشاکە دڕاوە، یان ئەو ڕواڵەتەی تۆ بە ناباشی دەبینیت، هەستێکی گەورە هەبێت، کەسێکی بەقەدر بژی.. زۆر کات لە ژیانی ڕۆژانەماندا لە ئەرکو کارەکانماندا، یان لە ماڵەکانماندا، ڕووبەڕووی کەسانێك بووینەتەوە، جا یان کارمەندە، یان کارگوزارە، یان خزمەتکاری ماڵەکانمانن.. چەندە گەورەییە کە لە ڕوویاندا گەورەیی خۆمان، گەورەیی ئەو باوەڕەی هەمانە، یان جوامێریی ئەو نەتەوەی کە هەمانە، لە ڕوویاندا بنوێنین، بتوانین ببین بە چرایەك بۆ بەختیارکردنی دڵەکان، پاشان ڕۆشنکردنیان بە نوری ئیمان...

خۆشەویستان لە یەکێك لە وڵاتە عەرەبییەکاندا، مامۆستایەکی بەڕێز بۆمان دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لەژوری مامۆستایان دانیشتبووم، پیاڵەیەك چایم بەدەستەوە بوو، چاوەڕوان بووم کەمێك سارد بێتەوە؛ بۆئەوەی بیخۆمەوە، بەڵام هێندەی نەبرد، زەنگی چوونە پۆل لێیداو دەبوایە زۆر بەپەلە بچم بۆ پۆل بۆ وانەوتنەوە، دەڵێت:لەو ناوەدا، کارگوزارێکی فلیپینیم بەدی کردو زەردەخەنەیەکم بۆ کردو پیاڵە چاکەم دایە دەست... بۆ ڕۆژی دواتر ئەو کارگوزارە هاتە لام، بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو پێی گوتم: یەکەم جارم بوو زەردەخەنەی مامۆستایەك ببینم بە ڕوومدا، پاشان چایەکەم پێ بدات!! بۆیە مامۆستاکە دەڵێت: زۆر هەستم بە شەرمەزاری کردو لە وەڵامیداو گوتم: ئێمەی موسوڵمان ئەوە ڕەوشتی خۆمانە.. کارگوزارەکە گوتی: من دووساڵە لێرەم. هیچ کەس قسەیەکی لەگەڵدا نەکردووم. هیچ یەکێك زەردەخەنەیەکی بۆ نەکردووم. پاش ئەم قسانە گوتی: من بڕوانامەی ماجستێرم هەیە لە زانستدا، بەڵام هەژاریو پێویستیی ژیان وای کردووە، کە بەم کارە ڕازی بم. مامۆستاکە دەڵێت: سەرەتا باوەڕم بە قسەکەی نەدەکرد، بۆیە ویستم تاقی بکەمەوە، بۆ ئەو مەبەستە بانگهێشتم کرد بۆ ماڵی خۆمان، کچەکەم کە لە قۆناغی پێنجی ئامادەیی بوو، پرسیاری هەبوو لەسەر بابەتی زانست.. دەڵێت: زۆر بەشێوەیەکی شارەزایانە، وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە، بەوێنەی شافەرهەنگو مەوسوعەیەکی زانستی بەزمانی ئینگلیزی قسەی دەکرد، دەڵێت: پاش ئەمە لە ڕاستی قسەکانی دڵنیابووم.

لەو ڕۆژە بەدواوە، هەموو ڕۆژانێکی هەینی سەردانی دەکردین، ئێمەش بەوپەڕی ڕێزەوە میوانداریمان دەکرد، دوای ماوەیەك موسوڵمانبوونی خۆی ڕاگەیاند. هەر بەوەشەوە نەوەستا، توانی چەند هاوڕێیەکی قەناعەت پێ بهێنێتو ئەوانیش موسوڵمان ببن.

هۆکاری هەموو ئەمانە چی بوو؟ ماندووبوونو هیلاکی زۆری پێویست نەبوو، تەنهاو تەنها.. زەردەخەنەیەكو پیاڵەیەك چایو بەس.

# کارێکی سادەو بەرهەمێکی گەورە....!!

کارزان مەحموود





# لێکدانەوەی کەسایەتیت، بەپێی مانگی لەدایکبوونت.. مانگی هەشت

خۆشەویستان هەروەکو لە سەرەتادا باسمان کرد، هەڵسەنگاندن بەپێی مانگی لەدایکبوون، سەرەنجامی کۆمەڵێك توێژینەوەو بەدواداچوونی زانایانی دەروونناسییە، لەسەر ئەو کەسانەی کە لەو مانگانەدا لەدایکبوون، واتە: زانایانی ئەو بوارە نموونەیان لە هەر مانگێك وەرگرتووە، ڕوونتر بڵێین: چەند کەسێکیان لە هەر مانگێك وەکو سامپڵو نموونە وەرگرتووە، دواتر بەدواداچوونیان بۆ کردوونو بەوردی سەرنجی هەڵسوکەوتو سرووشتو ئاکاریان داونو لای خۆیان تۆماریان کردووە، پاشانیش گەیشتوونەتە ئەم ڕاستییەی کە دەشێت هەر یەك لە مانگەکان، خاوەنی کۆمەڵێك سیفات بن، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە لە سەدا سەد هەموو مرۆڤێك بەو شێوەیە بێت، نەخێر بەڵکو بەشێوەیەکی گشتی، دەتوانین بڵێین، خاوەنی ئەم سیفەتانەن، ئەوەی لێرەدا ئێمە مەبەستمانە، ئەوەیە کە بتوانین وەکو ئاوێنەیەك سیفەتەکان بە ئەرێنیو نەرێنییەوە بخەینە ڕوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەمانەوێت هەر یەکەمان هەوڵ بدات، سیفەتە نەرێنییەکان بگۆڕین بە سیفەتی ئەرێنی، ئەمەش مەبەستە سەرەکییەکەی ئێمەیە؛ چونکە دڵنیاین کە هەموو کەس دەتوانێت سیفەتە ناشیرینەکان لە خۆی دابڕنێتو لە بری ئە سیفەتە نەرێنیانە بە سیفەتی ئەرێنی خۆی بڕازێنێتەوە.. لەم ژمارەیەشدا باس لەو کەسانە دەکەین کە لە مانگی ئابدا لەدایك بوون:

**سیفەتە ئەرێنییەکانی ئەو کەسانەی کە لە مانگی (ئابدا) چاویان بە ژیان هەڵهێناوە:**

١- حەز بە گاڵتەو گەپو سوعبەتو قسەی خۆش دەکەن.
٢- کەسانێکی سەرنجڕاکێشن، بەئاسانی سەرنجی بەرامبەر ڕادەکێشن.
٣- کەسانێکی هەستناسكو بەسۆزو ڕۆمانسیو بەبەزەیین.
٤- ئازاو چالاكو دەستپێشخەرن.
٥- جێگیرو دامەزراوو خاوەن سیفاتی سەرکردایەتیکردنن.
٦- دەزانن چۆن دڵنەوایی کەسانی بەرامبەر بکەن.
٧- کەسانێکی بەخشندەو دڵفراوانن.
٨- خاوەنی ڕۆحێکی جوانو ناوازەن.
٩- وردەکارنو تێبینییەکانیان زۆر بەهێزە.
١٠- بیرکردنەوەیان خێرایە.
١١- خاوەنی بیرۆکەو پڕۆژەی سەربەخۆن.
١٢- حەز دەکەن سەرکردایەتی بکەن، نەك سەرکردایەتی بکرێن.
١٣- خاوەنی توانای هونەریو بەرگرین.
١٤- دەزانن چۆن پشوو بدەن.
١٥- حەز بە هاوڕێیەتیو دروستکردنی هاوڕێیەتی دەکەن.
١٦- کەسانێکی بزۆزنو بەخێرایی کارەکانیان ئەنجام دەدەن.
١٧- حەز بە هیواو ئاواتی بەرز دەکەن.

**سیفەتە نەرێنییەکانی ئەو کەسانەی لە مانگی ئابدا لەدایك بوون:**

١- زۆر شانازی بە خۆیانەوە دەکەن.
٢- حەز دەکەن کەسانی بەرامبەر مەدحو ستایشیان بکەن.
٣- زوو تووڕە دەبنو بەرامبەر دەتوانێت بەئاسانی تووڕەیان بکات.
٤- زۆر بەتوندی تووڕە دەبن لە کاتی گاڵتە لەگەڵ کردندا.
٥- ئیرەیی زۆر دەبەن بە بەرامبەر.
٦- کەسانێکی هەستیارن، بەڵام ڕقو کینە لە دڵ ناگرن.
٧- بەرگری جەستەیان دژی نەخۆشی لاوازە.

بەو هیوایە بتوانین ئەم سیفەتە نەرێنیانەش بگۆڕین بە سیفەتی ئەرێنی.



# هەیاسی خاس

ئیاسی کوڕی معاویە، ساڵی ٤٦ کۆچی لە ناوچەی یەمامە لە دایکبووە، هەر لە تەمەنی منداڵیدا لەسەر دەستی باوکی زانستی شەرعی خوێندووەو لە سەرەتای تەمەنیدا تەواوی قورئانی پیرۆزی لەبەرکردووە، هەیاس زانستەکانی فیقهو تەفسیرو فەرمودەی لای گەورە زانایان خوێندووە، لەوانە مامۆستای پایەبەرز (حەسەنی بەصری)، پێشەوا (محمد بن سیرین)، هەیاس لە تەمەنیدا گەیشتووە بە هەندێك لە هاوەڵان، لەبەرئەوە بە شوێنکەوتووان ئەژمار دەکرێت، هەیاس هەر لە منداڵییەوە نیشانەی زیرەکیو لێهاتوویی پێوە دیار بووە، بە جۆرێك هەر کەس زۆر زیرەكو لێهاتوو بێت پێی دەوترێ هەیاس، ئەو کەسێکی ناسراوو بەناوبانگی سەردەمی خۆی بووە، لە کوردەواریدا بە هەیاسی خاس ناوبانگی دەرکردووە، لەبەرئەوە ئێمەش هەر بە هەیاس ناوی دەبەین، هەیاس کەسێکی خوداناسو باشو چاك ڕەفتار جوان بووە لەگەڵ دایكو باوکیدا، هەربۆیە کاتێك لە معاویەی باوکیان پرسیوە هەیاس چۆن کوڕێکە؟ لە وەڵامدا وتویەتی: هەیاس باشترین کوڕە!

هەیاس کەسێکی ڕاستگۆ بووەو هانی خەڵکیشی داوە بۆئەوەی ڕاستگۆبن، لەم گۆشەیەدا هەر جارەو باس لە چیرۆکێکی ژیانی هەیاسی خاس دەکەین، کە چیرۆکەکانی ژیانی هاوشێوەی باڵوڵی حەکیم لێوان لێوە لە زیرەکیو لێهاتوویيو دانایی، بەو هیوایەی هەم سود لە زیرەکییەکەی وەربگرینو هەم چێژ لە خوێندنەوەی چیرۆکەکانی ببینین!

یەکەم ڕووداوو بەسەرهاتی هەیاس لە ڕووداوێکی سەردەمی منداڵی هەیاسەوە دەست پێ دەکەین، هەیاس هەر لە منداڵییەوە بە زیرەکییو دانایی ناسرابوو، ڕۆژێك خێزانەکەی هەیاس دەنێرن بۆ لای مامۆستایەکی جولەکە کە خەڵکی فێری زانستی بیرکاری دەکرد، ئەو کەسێکی زیرەكو بەناوبانگ بوو لە ناوچەکەدا.. ڕۆژێکیان هەندێك لە هاوەڵانی مامۆستاکە واتە (کۆمەڵێك جولەکە)، دێنە سەردانی جەنابی مامۆستاو سەبارەت بە کاروباری ئاینەکەیان پێکەوە قسەیان دەکرد، هەیاس بە بێدەنگی دانیشتبوو، ئەوانیش گوێیان پێ نەدەدا لەبەرئەوەی منداڵ بوو، مامۆستاکە وتی: ئایا سەرتان سوڕنامێنێت لە موسوڵمانان، چەندە نەزانن! ڕۆژێکیان گوێم لە مامۆستایەکیان بوو باسی بەهەشتی بۆ دەکردن، دەیگوت: لە بەهەشتدا مرۆڤ پێویستی بە چوونە سەرئاو نییە، ئەو خواردنو خواردنەوەی دەیخوات نابێت میزو پیسایی، منیش پێکەنینم هات بەو قسە سەیرو سەمەرە! هەمووان قاقایان لێدا بەو قسەیە!

هەیاس بە ڕووی مامۆستاکەیدا هەڵنەشاخییەوە، بەڵکو وەکو قوتابییەکی بە ئەدەب داوای مۆڵەتی کردو وتی: مامۆستا مۆڵەتم دەدەیت قسە بکەم؟ مامۆستاکەی ئاوڕی دایەوە بۆ لای هەیاسی بچکۆلانەو وتی: فەرموو قسە بکە.

هەیاس وتی: ئایا هەموو ئەو خۆراكو خواردنەوەی لە دونیادا دەیخۆین دەبێتە میزو پیسایی؟

مامۆستاکەی وتی: نەخێر..

هەیاس وتی: ئەی کەواتە ئەو بەشەی دەیخۆینو دەیخۆینەوەو لە جەستەشمان ناچێتە دەرەوە بۆ کوێ دەچێت؟

مامۆستاکەی وتی: دەڕوات بۆ نێو جەستەمان، تا ئەندامەکانی لەشمان سوودی لێ ببینن..

هەیاس وتی: کەواتە ئەگەر لە دونیادا بەشێکی ئەو خۆراکانەی دەیخۆین ناچێتە دەرەوەی جەستەمانو دەبێتە خۆراكو ڤیتامین بۆ ئەندامەکانی جەستەمان، ئیدی چ ڕێگرێك هەیە لەوەی لە بەهەشتدا هەموو ئەو خۆراکەی دەیخۆین ببێتە خۆراك بۆ جەستەمانو ئەندامەکانی لاشەمان سوودی لێببینێت؟؟!!

بە وەڵامی ئەم منداڵە بچکۆلانە مامۆستا سەرسام بوو، قسەیەکی بۆ وتن پێ نەبوو!

هەیاس هەر بە منداڵی بەو شێوەیە چاونەترسو زیرەك بووەو وەڵامی گونجاوی بۆ هەموو پرسیارێك هەبووە، ئیدی کاتێك گەورە بوو، هەواڵی زیرەکیو لێهاتوویی هەموو ناوچەکەی گرتەوە..

# وەڵامی بەجێ

01

* نەخۆش و دکتۆر:

نەخۆش: جەنابی دکتۆر هەست بە ماندوێتیو ئازاری گەدەم دەکەم؟

دکتۆر: زۆر مەخۆ.

نەخۆش: ئایا خـواردن گەدە ماندوو دەکات؟ باووباپیرانمان زۆر لە ئێمە زیاتریان دەخواردو گەدەشیان وەکو ئاسن وابوو!

دکتۆر: باووباپیرانمان هەموویان مردن!

02

* پزیشکی ددان و مشتەری:

مشتەری: جەنابی دکتۆر ئەگەر نەخۆشت بۆ بهێنم، عموولەم پێدەدەیت؟

پزیشـکی ددان: بێگومان، هەر نەخۆشـێکت بۆ هێنام، خرێیەکت بە خۆڕایی بۆ هەڵدەکێشم!

03

* ئیبراهیمی ئەدهەم کەسێکی بینی قسەی بێهودەو بێ سوود دەکات بۆ هاوڕێکانی.. ئەدهەم هەڵوێسـتەیەکی کردو گوتی: ئایا لەسەر ئەو قسانەت کرێیەك، یان دیارییەك وەردەگریت؟ کابرا گوتی: نەخێر!

ئەدهەم گوتی: دڵنیای لەوەی لەسەر ئەم قسانە سزا نادرێی لە ڕۆژیی دواییدا؟

کابرا گوتی: نەخێر.

ئەدهەم گوتی: کەواتە: چیت داوە لە قسەیەك کە نە پاداشتی لەسەر وەردەگریتو نە دڵنیای لەوەی لەسەری سزا نادرێیت!

# گۆرانی بڵێ بۆ ژیان

**هەمیشە ئەوەت لەیاد بێت، کە هیچ شتێك لە ژیانی مرۆڤدا، بەردەوام نابێت، کەواتە: نە زۆر بە خۆشی شادمان بەو نە زۆر بە ناڕەحەتییەکانیش نیگەران بە.**

سوقرات

**ئەگەر ململانێ نەبێت، هەرگیز پێشکەوتنیش نابێت.**

فریدریك دوگلاس

لەو ڕێسایانەی پێویستە هەمیشە لەیادت بن: یەکەم: هەرگیز پارەو سامان بەفیڕۆ مەدە.. دووەم: هەرگیز ڕێسای یەکەم لەیاد نەکەیت.

وارین بافیت- ملیاردێر

باشترین شت کە لە کاتی بارانبارینیدا ئەنجامی بدەیت، ئەوەیە کە لێبگەڕێی ببارێت.

هێنری لۆنجفیلۆ: نووسەر

ڕازی بە بەوەی هەتە، دڵخۆشبە بە شتەکان وەکو هەن، ئەو کاتەی کە هەست دەکەیت، هیچت کەم نییە، هەموو جیهان دەبێتە موڵکی تۆ.

لاوتسو: فەیلەسوف



# بڕیارەکانم

ن: د.طارق السویدان
و: فێنك جەمال

ژیان هەموی کۆمەڵێك بڕیارە، بە دەستی خۆمانەوەن؛ خۆشحاڵی، دڵتەنگی، دەوڵەمەندی، هەژاریی، زیرەکیی، بەختەوەری... هتد.

ئەو کەسەی خۆشحاڵەو دێتو دەڕواتو پێدەکەنێتو سڵاو لە هەموو کەس دەکاتو کاتێك کاری ئاسان دەبێت سوپاسگوزارەو کاتێکیش بەربەست دێتە پێشی، هەوڵی چارەسەری بۆ دەداتو بە ئامانجەکەی دەگات، ئەوا خۆی بڕیاری داوە، کە ژیانی وا بێت، ئەی چەندین کەسی هەژارو نەدارتان نەبینیوە، زۆر خۆشحاڵو سوپاسگوزار بن، کەواتە: ئەمە دەیسەلمێنێت کە خۆشحاڵی لە دڵدایە، نەك لە ماددە.

کەسانی بێتاقەتو بێزارو لۆمەچیو ڕەشبین، هەموو شت لای ئەو ناخۆشە هیچ شتێك تامی نەماوەو هەر جاران خۆشتر بووەو ئە مە ژیان نییە، ئەویش خۆی بڕیاری داوە، کە بەم جۆرە بژی. بۆ نموونە: کەسێك خراپەیەکم بەرامبەر دەکات، دەتوانم لێی خۆشببم، یان هەمیشە دژی بوەستم، لێخۆشبوون بڕیاری تۆیە ڕاستە، لەوانەیە هەندێجار هەندێ بڕیار، لەسەر دەروون ئاسان نەبێت، هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ ﴾ الشوری: ٤٣.

ئەمە مانای ئەوە نییە کە بڕیارت دا دڵخۆش بیت، ئیتر بۆت نییە خەمبار بیت، نا تەنانەت پێشەوامان پێغەمبەر (سەلامی خودای لێبێت) چەندین جار خەمبار بووە، بەڵام بەردەوام نەبووە، بە جۆرێك ژیانی بیر بچێتەوە.

هەستکردن بە ئارامی دڵو دەروون، خۆشحاڵی بڕیارە؛ چونکە کەس ناتوانێت وات لێبکات کە زۆر قسە بکەیت، تووڕە بیت، بترسیت، تا خۆت ڕێگە نەدەیت، هەمووی بڕیاری خۆتن، بڕیار بدە کە خۆش بژیت کە ژیانتانو بڕیارەکانتان لە ناو دەستی خۆتاندا بێت، کەس نەتوانێت کاری لێبکات، تا خۆت ڕێگا دەدەیت،

کەواتە: ئێمە لە شەمەنەفەرێکداین، کە هەرگیز لە ڕۆیشتن ناکەوێتو خۆمان شۆفێرەکەین، کام ئاڕاستەیەمان بوێت، بەو لایەدا دەڕۆین. ژیانمان هەمووی کۆمەڵێك بڕیارە، بەڵام قورسترین بڕیار، گۆڕینی خودە، تکاتان لێ دەکەم کە ئەم بڕیارە بدەن، ئەوەی باوەڕی لاوازە، با خۆی تازە بکاتەوە، ئەوەی هەست دەکات لە شتێکی خۆی دڵتەنگ دەبێت، با دووبارەی نەکاتەوە، ئیدی با لە پاشەملە، باسی کەس نەکەین، هەر کاتێك ویستمان باسی کەسێك بکەین، وا دانێین کە ئەو کەسە خۆی دانیشتووە، گەر بۆت کرا باسی بکە، گەر نا باسی مەکە؛ چونکە ڕاستە خودی خۆی ئامادە نییە، بەڵام لەوە گەورەتر ئامادەیە کە خودایە، بڕیار بدەن، کە ئیدی بە ژیانی خۆتانەوە سەرقاڵ ببن، کەسانی دەوروبەر تەنها باشەکانیان لێ وەربگرنو ئەزموون لە خراپەکانیان وەربگرن، کە دووبارەی نەکەنەوە، لە هەڵەکانتانەوە فێر بن، هەرگیز لە هەڵەکانتان بێزار مەبن، بەڵکو بە دووبارەکردنەوەی ڕازی مەبن، ئەوەبن کە دەیڵێن وشەکانتان بڕیارەکانتان بکەنە کردار، تا دەوروبەرتان، بە بڕیارەکانتان سەرسام بکەن.



# گەشتی بیر

شۆخان عەلی

یەکێك لە خولیاکانی مرۆڤ، گەشتکردنە. گەڕان بەناو ڕاستییەکانی جیهان، دیتنی سەیرو سەمەرەکان، سرووشت، کەلتوورو دەستوورو ئایینە جیاوازەکانو چێژو پەندوەرگرتن لەم دیمەنانەو هەزاران دیمەنی هاوشێوەو جیاواز، بەمانە مێشك فراوان دەبێتو سنووری بیرکردنەوە زیاد دەکات، جیاوازییەکان پەسەند دەکات، فێردەبێتو پرسیار دەکات، بە زمانی جیاواز گفتوگۆ دەکات، دەخوێنێت، دەخوێنێتەوەو بیرکردنەوەو لێکدانەوەکان بنووسێتەوە لەسەریان، بەڵام لە هەمان کات ڕێژەی ئەم کەسانە هێندە زۆرنین، کە بیریان بەکار دەهێنن، بەڵکو دەڕۆنو دێنو دێنەوە، هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێت، پاشانیش بەداخەوە، هەندێجار پێچەوانە ڕوودەدات، واتە: خراپەکان خراپتر، خەمبارەکان خەمبارتر، ناپاکەکان ناپاکتر ...هتد، دەکرێت دوو ژمارە بچنە گەشتی هاوکێشەیەك، کە یەکێکیان بچووك ببێتەوەو ئەوی دی گەورەتر! ئەمە بۆچی؟

چونکە ئەم، هاوکێشەی موجەبی هەڵبژاردو ئەوی دی سالب، یان ئەم لەگەڵ ژمارەی شیاو مامەڵەی کردو ئەنجام کردیە ژمارەی ناکۆتا، بەڵام ئەم لە هاوکێشەیەکی بێسەروبەر خۆی بینییەوەو کردیە کۆمەڵەی بەتاڵ! ڕەنگە هەر یەکێك لەم ژمارانە بە بیرکردنەوەیەك ڕۆیشتبنە ناو هاوکێشەکەیانەوە، کە هەردووکیان خۆیان بە سەرکەوتوو دانابێت. ڕەنگە تۆش بیر بکەیتەوە کە ئەم هاوکێشانە چ پەیوەندییەکیان بەم گەشتی جیهانەوە دەبێت، ئێستا پێت دەڵێم کە زۆر پەیوەندیدارن؛ چونکە سرووشتی مرۆڤ، هەر بەم شێوەیە.. کاتێك هەموو جیهان دەگەڕێتو دێتەوە، تازە لە خاڵی سەرەتایدایەو هیچ دەستکەوتێکی نییە، کە کۆمەڵەی بەتاڵ هەر ئەمەیە. هاوکێشەکانی دیکەش، هەر بەهەمان شێوە، واتە: کاتێك بیرکردنەوەی هەر هەمان ئەوەی جاران بوو، قسەکردن هەمان ڕیکۆرد بوو، کاتێك نەیتوانی لە هەر جێیەك وانەیەك فێر بێت، دواتر منو تۆو کەسانی دیکەی لێوە فێربن، ئیتر ئەمە چی کردووە؟ بۆیە گرنگە بڵێین یەکەم گەشتی مرۆڤ، کە پێویستە بیکات، بریتییە لە (گەشتی بیر، نەوەك لاق)، ئەوانەی کە دنیایان ژێراو ژوور کرد، ئەوانەشی کە سەرلەنوێ چەندبارە بنیاتیان نایەوە، ئەوانەی نەمرییان تۆمار کرد، ئەوانەشی مرۆڤایەتییان فێری مرۆڤ کردو...هتد، هەموو ئەمانەو چەندانی دیکە، سەرەتا گەشتێکیان بەناو بیری خۆیاندا کردووە، هەندێکیان جوانییەکانیان دەرك کردو خستیانە ڕوو، ئەوەی خراپە بوو سەرکۆنەیان کردو بە سەرکەوتنو ئاسوودەیی ناکۆتاو هەروەها باشییەکانی ژیان شاد بوونەوە، دڵنیام تۆش هەمان شادیت دەوێت، هەمان ئارامیو هەمان مرۆڤبوون، بەڵام بە قاڵبی خۆتو هەوڵدانو ماندوبوونی خودی خۆتان، ئەوە ئاسانە، پێویست ناکات هەنگاوی سەرەتایی بە بڕینی مەودای دووری نێوان وڵاتان بێت بۆ تۆ، بەڵکو پێویستی بە گۆڕینو باشکردنی ڕێگای بیری تۆ هەیە، پاشان کە بیرکردنەوەی تۆ باش بوو، ڕوانینەکانتان هیوابەخشبوو، ئەو کات ڕوو لە هەرکوێ دەکەیت، بڕۆ! هەموو شتێك لەگەڵ بیری ئێوە دەڕوات، کەواتە: هەموو شت بەباشی دەڕوات لەو جێیەی کە تۆی لێبوو. واتە: تۆیەك کە بە تەواوی هزرو بیرت کار دەکەیت، نەوەك تەنها ئەندامەکانی جەستەت، تۆیەك کە بە هەنگاوەکانی ناخت ئاوێنەی دەرەوە ڕوونترو گەشاوەتر دەکەیت، تۆیەك کە بیرکردنەوەکانت لە چوارچێوەی کارەکانت باخی جوانیو هیواو سەرکەوتنت ناشتووە، بمێنەرەوەو جارێ گەشتی جیهان بوەستێنەو گەشتی بیری بنیاتنەرت دەست پێبکە!

ئەوکات لە هەموو ڕووداوەکان، جوانییەکانو لە پەرداخە نیوەکان، نیوەپڕەکەیو لە میوەی نیوە خراپ، ئەو لایەی کە جوانەو لە مرۆڤدا تەنها سیفاتە جوانەکانیو لە هۆکاری بوونی خۆت تەنها لە گرنگیی تۆ لای پەروەردگارو هۆکاری هەموو باشییەك، لە باشییەکەیداو هەر خراپەیەك لە خێرەکەیداو تێگەیشتن لەوەی هیچ شتێك بەبێ بنەما، بوونی نییەو هیچ نەبوویەك، بەبێ هۆکارێکی دادپەروەرانە نییە، ئەمەیە گەشتی بیرت، ئەگەر دەتەوێت ژیانت بنووسرێتەوەو ژیانت ڕێنیشاندەری بەختەوەریو ڕاستی بێت، کەواتە: کەلوپەلەکەت کۆ بکەرەوەو بەرەو فووڵاییەکانی بیرو هزرت هەنگاو بنێ.

# لەوانەیە

## ڕۆمانەکە لە نیوەیدا تەواوبێت!

و: چیمەن لەتیف

ئـەو قازانجـە چییـە، کە ئێمـە لەبیرۆکـەی مـردن دەیکەین؟! پرسـیارەکە هیچ نامۆیەکی تێدا نییە! ئاڕاسـتەکردنی ئەو پرسـیارە، ئاماژە نییە بۆ تاریکیو ڕەشیبنی، من لە خستنە ڕووی ئەو پرسیارەدا بەدوای سـوودو واتـادا دەگەڕێم. گومانـی تێدا نییە، نووسـەری ئەم چەنددێڕانەو خوێنەرەکانی، گەشـتی ژیانیـان لەم دنیا پانو بەرینەدا کۆتایی پێ دێت؛ تا خولێکی دیکەی ژیان دەسـت پێ بکەن، ئەو خولە بەشادی، یان بەئازار تەواوی دەکەن.

لەوانەیە کاتێك خوێنەر ئەم چەند دێڕانە دەخوێنێتەوە، من گۆڕێکی تاریکی ترسناك لەباوەشی گرتبم. لەبەرانبەر بیرۆکەی مردندا، مرۆگەل گشتیان وێستاون، بارودۆخێك بریتی بووە لە تێفکرین، لەوەگەڕێ دنیاو خۆشییەکانی مەرگی بیر بردونەتەوە، من لەبارەی دڵانی زیندوو ئاوەزی بەئاگاوە قسـەت بۆدەکەم، خۆشـم دێ لەبارەی مەرگەوە هەڵوەستەیەك بکەم، لەبارەی بیری ئەو کەسـانە، تێڕوانیینەکانم دووبارەو چەند بارە بکەمەوە، لە فەلسـەفەی تێڕوانینیاندا لەبـارەی مردن، تا هێڵی کۆتایی بڕۆم، تا ئەو کاتەی چۆن پەردەکە شۆڕ دەکرێتەوە.

ماوەم بدەن لەبارەی (گۆتە)وە، ئەو فەیلەسوفە ئەڵمانییە گەورەیە گفتوگۆ بکەین، ئەم مەردمە زۆر بەکەساسیو خەمینی ژیانی بەڕێ کرد، تەنانـەت کاتێك دەخەوت، خەنجەرێکی وەژێر تەپۆڵکی دەنا؛ بۆئەوەی هەرکات وەخەوەر هـات، لێبڕانانە خەنجێرەکە لەدڵیدا قومکات، بەڵام کاتێك شکسـتی دەهێنا خۆی بکوژێت، بڕیاری دەدا ناسـۆرییەکی بکات بەڕۆمانێك، لەکۆتایی چیرۆکەکەدا پاڵەوانەکەی دەکوژرا.

(ئالام فرتەر)، ئەو پیاوەی زیاد لەهەشتا ساڵ ژیا، هەزارانی وەگریان هێنا، ئەو دەیگوت: هەمیشـە لەخاوەن چانسـەکان دەهاتمە ئەژمار، لە کۆتاییـدا گلەیی لەژیانم ناکەم، بەڵام بەڕاسـتی دەڵێم ژیانم هەمیشـە غەمو پەژارەو نارەختی بووە، بەدرێژایی تەمەنم مانگێك بەئاسوودەیی پاڵم نەداوەتەوە، لەژیاندا هەمیشـە دەبوو پـاڵ بەبەردەکەوە بنێم، تا دەیگەنمە سـەر گردەکە، هـەرکات کوچکەکەم گەیاندبا بان تەپۆڵکەکە، بەردەکە خلۆر دەبوەوە بۆ شیوەکە، لەنوێوە دەستم پێدەکردەوە. ئەوەیە ژیان، پڕە لەکەساسـیو نەگبەتی، بەئازارە، سـەختە، گەرچی بەشێوەی ئاڵاو واڵا دەردەکەوێت.

پاشان (گۆتە) لەبارەی مردنەوە دەدوێت: کاتێك بە ژیانمدا شۆڕدەبمەوە لە پیرێتیەوە بۆ لاوێتی، ئەوم وەبیردێتەوەو دەکەوێتە بەرچاو کە کەمێکی کەم لەهاوڕێیانی دەورانی گەنجیم لەژیاندا ماون، ژیانم وەك میوانخانەیەکی بچووکی هاوینە دێتە بەرچاو.

کاتێـك دێینـە دنیاوە، ئەو ڕاسـتییەمان لا درووسـت دەبێت، کە بەر لەئێمە کەسـانی دی هەبوون، بەڵام ئەو کەسـانە زۆر نامێننەوە، بنەوبارگەیـان دەپێچنـەوە، کۆچیان بـۆ ئێمە بەئـازارە، دواتر ژیان دەکەوێتە دەسـت ئەوانەی پاش ئەوان دێن، بەهەمان شـێوە ئەمانیش کـۆچ دەکەن، لەگەڵ نەوەی نوێدا بەجێمـان دەهێڵن، کاتێك ئەو نەوە نوێیە پێگەیشتوون، مەمانان خۆمان بۆکۆچ سازکردووە، لەنێوان ئێمەو ئەواندا، چ پەیوەندیەك نییە.

کاتێـك لەبـارەی دنیـا لەباسـەکەی( گۆتـە) تێدە فکـرم، کە بە (میوانخانەیەکـی هاوینـەی دەچوێنێت)، وای دەبینـم میوانەکانی ئەو میوانخانەیـە، نابێـت بەکەماڵی ڕاحـەت پاڵ بدەنـەوە، بەڵکو دەبێت وەك کەسـێك لە چاوەڕوانی فڕۆکە، یا شەمەندەفەرەکەی کە لەحاڵەتی ئامادەباشـیدا بێت ڕاکشـێن، تێشـووی ڕێگای دانـاوەو لەوپەڕی ئامادە باشـیدایە، جێگای ئێستای شـوێنی ئارامیو حەسانەوە نییە. بەڵکو لەو میوانخانەیەدا، وەك ڕێبوارێك پشوو دەدات.

بیرمەنـدی گەورە (محەمەد غەزالی) بەهەمان شـێوە گوزارشـتی لە دنیا کردووە، خودا لێخۆشـبوو کاتێك لە میوانخانەیەك دادەبەزێت، بیـر دەکاتـەوە لـەو جێگایە، ئاخـۆ دەبێت چەند کەس بـەر لە من، میوانـی ئەم شـوێنە بووبـن، داخۆ دەبێـت دوای مـن، چەندانی دی سـەردانی ئەم جێگایە بکـەن، پەیوەندیی من بـەم هۆدەیەوە چییە؟ هەستم کرد ژوورەکە، تەنانەت هوتێلەکەش وەك ئەم دنیایە وایە، لەپڕ دەردەکەوێتو پاشان لەچاو بزر دەبێت.

کەسـانێکی زۆر بێـرەدا هاتـنو تێپەڕیـن. هەندێکیـان یەکدییان بینی، چۆن میوانانی ئـەم هوتێلە، لەم هەیوانەدا بڕێکیان ئەوانی دیکە دەبینێـت. هەریەکەو لە کەشـێکی تایبەتدا، سـەرقاڵی ژیانی خۆیەتی، ئـەوەی پەیوەسـتی دەکات بەوانی دیکەوە، تێڕوانینێکـە بەتیلەی چاو، یاخود زەردەخەنەیەکی تیژپەڕە. بەم شـێوەیە هەموو نەوەیەك، دەگات بەوانی پێشتر، پاشان... پاشان بەکۆتا دەگات.

مـردن گەرچـی پێی خۆشـە بەسـاڵاچووان دروێنە بکات، بـەڵام ماوە نا ماوەیەك، ئەو بەرانەش دەدوورێتەوە، کە هێشـتا پێ نەگەیشـتوون، گەرچی وا گومان دەبرێت، ئەوان لە مردنەوە دووربن، بەڵام ئەمە تەنها تراویلکەیە.

باوکی ئەدەبی فەرەنسـی ( فیکتۆر هۆگۆ): لێکچواندنێکی قووڵی بۆ ئازارەکانـی مەرگ کردووە! ئـەو وای دەبینێت، کە مەرگی پیرەپیاوێك، وەك کەشتیەك وایە، گەیشتبێتە کەنار دەریا، بەڵام هەڵپڕووکانی تەمەنی لاوێك، وەك ئەو کەشتییە وایە، باهۆز لە ناوەڕاستی دەریادا لێی دابێتو تێکی شـکاندبێت، هەروەها مەرگی لاوێکی، تـا ڕادەیەکی زۆر چواندوە بە ڕۆمانێکی کاریگەر، کە لەناوەڕاستی ڕووداوەکاندا، چیرۆکەکە بەکۆتا دەگات. بەشـێوەیەك ئەو کۆتاییە شـۆکێكو کارەساتێکە بۆ هەرکەسێك دێڕێك، یان زیاتری لەو ڕۆمانە خوێندبێتەوە. بەگوێرەی فەلسـەفەکەی هۆگۆ، کـە دنیای چواندوە بە(میوانخانەیەکـی هاوینە)، دەبێت هێندە خۆماندوو نەکەیت، لەپێناو ڕژدی، چاوچنۆکیو خۆسەپاندندا.

ڕاکردن بەدوای خۆشـییەکانی دنیادا، بێ وێسـتانو دڵنیابوون لە جوانیی هۆکارەکانو پاکیی شـێوازەکانی، بەشـێوەیەك تووشـی تامان بکات، ئاماژەیە؛ بۆئەوەی ئێمە لەم کارەدا کاڵفامین.

لەم فەرموودەیەی پەیامبەر، جوانترو قووڵتر نییە، کە دەفەرموێت: (لەدنیـادا وەك ڕێبوارێـك بژی) ڕێبوارو نامۆ، لە ویـژدانو ژیانیاندا، بەشێوەیەك دەژین، کە دانیشتنو مانەوە مەحاڵە، کاتێك پێیەکانمان لە دنیاو خۆشـیەکانیدا ڕۆدەچن، یان کاتێك هەست دەکەین، هەنگاوەکان بەرەو نشێو ڕاپێچمان دەکەن، پێویستە بەسووکی هەنگاوەکانمان دابنێین.

دڵۆپەی تیشـك: لـەو چرکەسـاتەی لەدایك دەبیـن... هەنگاو بە هەنگاو لەمردن نزیك دەبینەوە (غادە سەمان)!

# لیرەی زێڕین!

ئەسکەندەر ڕەحیم

دەگێڕنەوە، لە گوندێکی دڵنشیندا، پیاوێکی دەوڵەمەندو خوداپێداو، تاقە کوڕێکی هەبوو، کە دایکی زۆر نازی دەکێشاو نەیدەهێشت دەست بۆ ساردو گەرمی ژیان ببات، تا گەورەبوو، بوو بە گەنجێك کە هیچ کارێکی نەدەزانی، خەوو خۆراکو پیاسەی کووچەو کۆڵانو سەرشەقامەکانی شارو خۆش ڕابواردن نەبێت، هەڵبەت بەو پارەیەی کە بەدزیی باوکییەوە، دایکی پێی دەدا!

بەیانییەکان، باوکی کوڕەکەی بانگ کردو پێی گوت:

ڕۆڵەگیان، تۆ گەورە بوویت، بوویت بە گەنجێکی بەخۆو پتەو، لەم ساتەوە دەبێت بە ماندووبوونو ئارەقی تەختی تەوێڵی خۆت، بژێویی خۆت پەیدا بکەیتو پشت بەخۆت ببەستیت.

کوڕەکەی گوتی: بابەگیان، ئەمن لە هیچ کارێکدا شارەزا نیم.

باوکی پێی گوت: بەڵام دەکرێت فێر ببیت، لەئێستە بەدواوە، دەبێت بچیت بۆ بازاڕو کار بکەیت.. هەتا لیرەیەکی زێڕ کۆنەکەیتەوەو بۆم نەهێنێت، نەگەڕێیتەوە بۆ ماڵ!

کوڕە لە ماڵ چوویە دەر، هەرکە پێی خستە ئەو دیو دەرگاکە، دایکی بەدوویدا هاتو لیرەیەکی زێڕی پێداو داوای لێکرد بچێت بۆ شارو ئێوارە بگەڕێتەوە؛ بۆئەوەی لیرەکە بدات بە باوکیو لافوگەزافی ئەوەش لێ بدات، کە بە ڕەنجو زەحمەتی خۆی پەیدای کردووە!

کوڕەکەش بەقسەی دایکی کردو ئێوارە گەڕایەوەو چوو بۆ لای باوکیو گوتی:

بابە گیان فەرموو، ئەمە ئەو لیرەیەیە کە داوات لێکردبووم، بەرهەمی کاری خۆمەو بە ماندووبوونێکی زۆر پەیدام کردووە!

باوکەکە لیرەکەی وەرگرتو بەجوانی لێی ورد بووەوە، پاشان هەڵی دایە ناو ئاگری بەکڵپەی سۆپادارەکەوەو گوتی:

ئەمە ئەو لیرەیە نییە، کە داوام لێ کردبوویت. پێویستە سبەی بچیتەوە بۆ شارو لیرەیەکی دیکەم بۆ بهێنی!

کوڕەکە بێدەنگی هەڵبژاردو هیچ قسەیەکی نەکردو بەرامبەر هەڵسوکەوتی باوکی، هیچ ناڕەزایەتییەکی دەرنەبڕی.

بۆ سبەی بەیانی، بەمەبەستی چوون بۆ شار، کوڕە چووە دەر، هەرکە پێی نایە ئەو دیو دەرگاکە، دایکی بەدوایدا هاتو لیرەیەکی زێڕی دیکەی پێداو پێی گوت:

زوو مەگەڕێرەوە، دوو سێ ڕۆژێك لە شار بمێنەرەوە، پاشان لیرەکە بهێنەرەوەو بیدەرە دەست باوکت.

کوڕەکە، ملی ڕێی گرتە بەر، هەتا گەیشتە ناو شار، سێ ڕۆژی بەسەر بردو گەڕایەوە بۆ لای باوکی گوتی:

فەرموو بابەگیان، ئەمە ئەو لیرەیەیە، کە داوات کردوو، دەردەسەریی زۆرم چەشت، تا پەیدام کرد.

باوکەکە لیرەکەی وەرگرتو لێی ورد بووەوە، دیسان هەڵی دایەوە ناو ئاگرە بەکڵپەکەی سۆپادارەکەوەو گوتی:

ئەمە ئەو لیرەیە نییە، کە داوام لێ کردبوویت. پێویستە سبەی بچیتەوە بۆ شارو لیرەیەکی زێڕینی دیکەم بۆ بهێنی!

کوڕەکە بێدەنگی هەڵبژاردو هیچ قسەیەکی نەکرد!

لە سبەی بەیانیدا، پێش ئەوەی دایکی لە خەو خەبەری ببێتەوە، بەدزییەوە لە ماڵ چووە دەر، ڕێی بەرەو شار گرتە بەر، مانگێکی ڕەبەقی لەوێ بردە سەر، پاشان گەڕایەوەو لیرە زێڕەکەی خستە سەر دەستیو لەناو مشتیدا توندی کرد؛ چونکە هەربەڕاستی هەتا ئەو لیرەیەی پەیدا کرد، ئارەقی ڕەشو شینی دەرکرد. پاشان دای بەدەست باوکییەوەو گوتی:

بابەگیان، سوێندت بۆ دەخۆم، ئەو لیرەیە، بە ڕەنجو زەحمەتی زۆرو دەرکردنی لێشاوێك ئارەقی ناوچەوانم پەیدام کردووە، تاڵیو سوێری بێئەندازم لە پێناویدا چەشتووە!

باوکەکە لیرە زێڕەکەی بە دەستەوە گرتو ویستی فڕێی بداتە ناو ئاگرە بەبڵێسەکەوە.. کوڕەکەش پەلاماری دەستی باوکی داو گرتی، نەیهێشت فڕێی بدات.. باوك پێکەنیو دەستی خستە سەر شانی کوڕەکەیو گوتی:

کوڕم، ئا ئێستە بوویت بە پیاوو دەتوانیت لەسەر پێی خۆت بوەستیت! ئەم لیرەیە، بەڕاستی بەری ڕەنجو هەوڵی خۆتە؛ چونکە بۆ لەدەستدانی بەخەم بوویت، کەچی بۆ لەدەستچوونی دوو لیرەکەی پێشوو، قسەت نەکردو بۆی دانەچوویت.. جا هەر کەسێك بەبێ ماندووبوونو زەحمەتی پڕئێش، پارەی هاتە نێو دەست، ئاساییە لای لەدەستی بچێتو دڵی بۆی نایەتە ئێش. گوتراویشە:

بێ خەبات هەر کەس، بێتە شای وڵات
ئاساییە لای، وڵات لە دەست بات



# نامەی ئەبراهام لینکوڵن بۆ مامۆستای کوڕەکەی

* کوڕەکـەم فێر بکە؛ تا بزانێت خەڵکی هەموو دادپەروەرو هەموویـان ڕاسـتگۆ نیـن، بەڵام فێری بکـە، کە لـە بەرامبەر هەر فێڵبازێکدا، مرۆڤێکی ڕاستگۆ هەیە.

* کوڕەکـەم فێـر بکـە کە لـە بەرامبەر هـەر سیاسـەتمەدارێکی خۆپەرستدا، سیاسییەکی جوامێریش هەیە.

* کوڕەکـەم فێـر بکە کە لە بەرامبەر هەر دوژمنێکدا، دۆسـتێکیش هەیە.

* دەزانـم کاتـی دەوێت، بەڵام فێری بکە ئەگـەر بە کارو زەحمەتی خۆی، دۆلارێکی دەسـت بکەوێت، باشـترە لەوەی لە شوێنێکدا، لەسەر زەوی پێنج دۆلار بدۆزێتەوە.

* کوڕەکەم فێر بکە لە دۆڕان پەند وەربگرێتو لە بردنەوە چێژ ببینێت، لە حەسـرەت خواردن ئـاگاداری بکەرەوە، ڕۆڵو کاریگەریی گرنگی پێکەنینی بیر بخەرەوە.

* ئەگـەر دەتوانیت، ڕۆڵی گرنگیی کتێبی لە ژیاندا بۆ باس بکە.

* پێی بڵێ: قووڵ ببێتەوە، لە باڵندەکان کاتێك بە دڵی ئاسماندا دەفڕن.

* ورد ببێتەوە لـە گوڵەکانی نێو باخچەو لەو هەنگانەی کاتێك بە هەوادا دەفڕن.

* کوڕەکەم فێر بکە لە قوتابخانە، کە باشـترە بکەوێت، تا بە قۆپی دەربچێت.

* کوڕەکـەم فێر بکە لەگـەڵ نەرموونیانەکاندا، نەرموونیان بێتو لەگەڵ سەرکەشەکاندا، سەرکەش بێت.

* پێی بڵێ بە بیروباوەڕەکانی خۆیەوە پابەند بێت، تەنانەت ئەگەر هەمووانیش، دژی ئەو قسە بکەن.

* کوڕەکەم فێر بکە هەموو قسـەکان ببیستێتو ئەو قسەیەی خۆی بە ڕاستی دەزانێت، هەڵیبژێرێت.

* کوڕەکـەم فێـری بەهاکانی ژیـان بکە، ئەگەر دەتوانیت کوڕەکەم فێـر بکە، لە لوتکەی غەمباریدا، زەردەخەنە بکات.

* کوڕەکەم فێر بکە لە ڕشتنی فرمێسك شەرم نەکات.

* کوڕەکـەم فێر بکـە دەتوانێت بۆ هزرو هەسـتەکانی، بڕێك پارە دیاری بکات، بەڵام نرخدانان لەسەر دڵ بێمانایە.

* پێی بڵێ ڕادەسـتی هەراوزەنا نەبێـت. ئەگەر خۆی بە هەق دەزانێت، لەسـەر قسـەی خۆی سـوور بێـتو بەو پەڕی تواناوە بجەنگێت.

* لە کاری فێرکردنی کوڕەکەمدا، نەرمو لەسەرخۆ بە، بەڵام بەنازپـەروەردەش ڕای مەهێنە. لێگەڕێ با ئازا بێت، فێری بکە باوەڕی بە خەڵك هەبێت.

* چاوەڕوانییەکی زۆرە، بەڵام بزانە چیت لەدەسـت دێت، کوڕەکەم منداڵێکی کەمتەمەنی زۆر باشە.



و: سەروەر عومەر

# ژیانو نیگەرانی

زاهیر زانا سەیدگوڵ

ژیانی مرۆڤ، بەکۆمەڵێك ئاستەنگو سەختیو دژواریدا تێ دەپەڕێت، کە دەبن بە هۆکاری دروستبوونی نیگەرانیو دڵەڕاوکێ، ئێمە دروستکراوێکین، حەزو خولیاو ئاواتی زۆرمان هەیە بۆ ئایندەو خەمو پەژارە بۆ هەڵەو کەموکورتییەکانی ڕابوردوو دەخۆین، کە دەبین بە مایەی هەڵگیرساندنو جۆشدانی کوورەی نیگەرانی، ئەویش هێواش هێواش ژیانمان دەسوتێنێت، ئەگەر نەزانین بەشێوەیەکی دروست مامەڵە لەگەڵ فشارەکاندا بکەینو بە ئاوی ئیمانو لێزانینو سەبرو گەشبینی نەیکوژێنینەوە، لەژیاندا پێویستمان بەبەشێکی دیاریکراوی نیگەرانی هەیە، کە هاوکارمان بێتو پاڵمان پێوە بنێت؛ بۆ بەدەستهێنانی خواستو ئاواتو ئامانجەکانمان، بەڵام ئەگەر لەو ڕێژەیە زیاتربوو، ئەوا دەبێت بە دەردێکی کوشندەو خەتەرناك، بەجۆرێك لەسەردەمی ئێستاماندا، بەبۆنەی زیادبوونی گرفتەکانەوە، نیگەرانییە پیشەییو کۆمەڵایەتیو خێزانیو ئابووریو سیاسیو خودییەکان زۆر زیادی کردووە، کە (ڕێکخراوی تەندرووستیی جیهانی) بە تاعوونی سەردەم ناوی دەبات.

نیگەرانی زیاد لەپێویست، لایەنی دەروونیو جەستەیی مرۆڤ دەڕوخێنێتو توانای کۆنترۆڵکردنی بارودۆخەکە لەدەست دەداتو ڕەفتارو تەندرووستیی مرۆڤ تێك دەدات، توێژینەوەکان دەڵێن: کە نیگەرانییەکان هۆکاری دروستبوونی لەسەدا هەشتای نەخۆشییە ترسناکەکانەو لەسەدا حەفتای سەردانکردن بۆ لای پزیشك زیاد دەکاتو نیگەرانیو دڵەڕاوکێ، دەبێت بە هۆی دەردانی دوو هۆرمۆنی ئەدرینالینو کۆرتیزۆن، کە دەبن بە هۆی زۆربوونی لێدانی دڵو زیادبوونی هەناسەدانو زۆر ڕۆیشتنی خوێن بۆ ماسولکەکانو زیادبوونی ڕێژەی شەکر لە خوێنداو کاریگەرییەکی زۆر دەخاتە سەر کۆئەندامی هەرسو دابەزاندنی توانای بەرگریی لەش، نیگەرانی کاریگەرییەکی بەرچاو دەکاتە سەر لایەنی دەروونی، کە دەبێت بە هۆکاری لەدەستدانی ئارامیو هاوسەنگیو هەست بەتەنهاییکردنو خەمۆکیو کاریگەریش دەکاتە سەر توانای بیرکردنەوەو تەرکیزکردنو لاوازکردنی یادەوەریو دەبێت بەهۆی تێکچوونی خەوو خواردن.

ئەزیزان هەر یەکێك لە ئێمە، دەکەوێتە ژێر کۆمەڵێك فشارو پەستانی ژیانەوە کە هۆکارە بۆ ئەوەی نیگەرانی دروست ببێت، بەڵام وەڵامدانەوەی هەموومان بۆ فشارەکان، وەك یەك نییەو باشترین کارێك کە ئەنجامی بدەین، ئەوەیە کە بە ئیجابی بیر بکەینەوەو ڕەشبینیو بێئومێدی وەلا بنێینو گرفتەکان بکەین بە هۆکاری گەیشتن بە سەرکەوتنو بزانین، کاری خودا بێ حیکمەت نییە، وەك دەفەرموێت: ﴿ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡ ﴾ البقرة: ٢١٦.

بەڕێزان وەك چۆن مۆبایل پێویستی بەشەحنکردنەوەو ئۆتۆمبێل پێویستی بە بەنزین هەیە، ئێمەش پێویستمان بە پشوودانو خۆنوێکردنەوە هەیەو گۆڕینی کەشو هەواو بینینی دیمەنە سرووشتییە دڵڕفێنەکان، هەستێکی ئاسوودەییمان پێ دەبەخشن، کە هاوکارن؛ بۆئەوەی زیاتر متمانەمان بەخۆمان هەبێتو توانای زاڵبوونمان بەسەر کێشەکاندا زیاتربێت، زۆر پێویستە فێربین، ڕۆژانە چەند جارێك هەناسەی زۆر قووڵ هەڵبمژین کە یارمەتیمان دەدات بیرو هۆشمان زیاتر کار بکاتو فشارە دەروونییەکان بڕەوێنێتەوەو هەست بەدڵنیایی بکەین، وەرزشکردن یەکێکە لەو هۆکارانەی هاوکارێکی باشە؛ بۆئەوەی کەسێتییەکی بەهێزو خۆڕاگرمان هەبێتو فشارەکان بڕەوێنێتەوە، دەبێت بەرنامەی خەوو خۆراکمان دروست بێتو بەڕێژەی پێویست بخەوینو ئەو خۆراکانەش بخۆین، کە کەمتر چەوریی قورسیان تێدایەو سەوزەو میوە بەشێکی گرنگ بن لە خواردنی ڕۆژانەماندا، تێکەڵاویی کۆمەڵایەتی، هۆکارێکی گرنگە، کە مرۆڤ هەست بە ئاسوودەیی دەروونی بکاتو هاوکاریکردنو دەستگرتنی کەسانی دی، لایەنی دەروونیی مرۆڤ، زۆر بەهێز دەکاتو خەمو خەفەتەکانی دەڕەوێنێتەوە.

ئەزیزان، دەبێت هەمیشە لەیادمان بێت، کە خودایەکی بەهێزو بەدەسەڵات هەیە، کە چاودێریمان دەکاتو یارمەتیمان دەدات بۆ زاڵبوون بەسەر گرفتەکانداو دەرگایەکی داخراو ناخاتە بەردەممان، کە توانای کردنەوەیمان نەبێتو تواناو بەهرەی زۆری پێ بەخشیوین، کە بە بەگەڕخستیان بگەین بە ئاواتو خواستەکانمانو دڵنیابین ئەو خودا میهرەبانە، ڕزقو ڕۆزیی ئێمە دەپارێزێتو نابێت خەم بۆ داهاتوو بخۆینو ئاخ بۆ ڕابوردوو هەڵبکێشین، بەڵکو نیگەرانییەکانمان بەو خودایە بسپێرین، کە بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکداو میهرەبانیی ئەو لە هەتاودا سێبەرەو لەباراندا چەترە بۆمان، بەو هیوایەی ژیانمان پڕ بکەین لە دڵنیاییو دووربین لەخەمو نیگەرانی.



منداڵێکی مەنگۆلیی کەساسو هەژارو کڵۆڵ بوو، هێشتا بەتەواوی چاوی بە ژیان ئاشنا نەبووبوو، تامو چێژی ئەوتۆی لە ژیان نەبینی بوو، کە دوچاری چەندان بەڵاو موسیبەتو دەردەسەری بووەوە، بەڵام دواتر توانی بەسەر کۆسپو تەگەرەو لەمپەرەکانی ژیاندا سەر بکەوێتو هاوکات گەورەترین ئیمپڕاتۆری لە مێژووی مرۆڤایەتیدا درووست کردووە.

بڕوا ناکەم کەس هەبێت، ناوی جەنگیزخانی نەبیستبێت، تەنانەت ئەو کەسەش کە حەز بە خوێندنەوە ناکات، یان هەر خوێندەواری نییە، ئاشنایە بە ناوی جەنگیزخان؛ چونکە چەندەها فیلمو دراما لەسەر ژیانی جەنگیزخان دەرکراوە.

جەنگیزخان ناوی (تیمۆژین) واتە: پۆڵای بەهێز، مێژوونووسان ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر بەرواری لەدایکبوونی، هەندێك پێیان وایە، کە تیمۆژین ساڵی ١١٦٢ زاینی لەدایکبووە، باوکی سەرۆکی هۆزی کیاد بووە، باوکی کەسێکی ئازاو بەهێزو چاونەترس بووە، تەنانەت هۆزەکانی دەوروبەری لێی ترساونو حسابیان بۆ کردووە.

زۆری نەبرد، باوکی تیمۆژین لە ساڵی ١١٧٥ لەلایەن دوژمنەکانییەوە دەرمانخوارد کراو ماڵاوایی لە ژیان کرد، ئەو کات تیمۆژین، تەمەنی تەنها سێزدە ساڵان بوو، ئیدی بەرپرسیارێتییەکی سەختو دژواری بۆ کوڕە گەورەکەی تیمۆژین بەجێهێشت، ئەو کات لەبەر کەمی تەمەنی، توانای بەڕێوەبردنی هۆزەکەی نەبوو، هەر بۆیە زۆرێك لە گەورە پیاوانی هۆزەکەی، لێی هەڵگەڕانەوەو قبووڵیان نەکرد، منداڵێکی تەمەن سیازدە ساڵان، فەرمانڕەوایەتییان بکات، خێزانەکەی تیمۆژین ئەو پۆستەیان لەدەست دا، ئیدی تیمۆژینو خێزانەکەی لە ژیانێکی سەختو دژواردا ژیانیان دەگوزەراند، کە ئەو کات جگە لە هەندێك مەڕوماڵات، خاوەنی هیچ شتێکی دیکە نەبوون، بەڵام ئەم بارودۆخە، زۆری نەخایاند، دایکی تیمۆژین خێزانە پەڕاگەندەکەی لەخۆ گرتو لەگەڵ کوڕەکانیدا دەستیان کرد بە تێکۆشانو هەوڵدانو ئارامگرتن بۆ گرتنەوەی دەسەڵات، توانی لە پلانەکەیدا بە هاوکاری کوڕە گەورەکەی تیمۆژین، کە نیشانەی سەرکردەو سەرکردایەتیکردنی تێدا بەدی دەکرا، سەرکەوتوو بێت، تیمۆژین جەستەیەکی بەهێزو دارڕژاوو پتەوی هەبوو، ئیدی تیمۆژین سەرنجی چەندین کەسی هۆزەکەی بۆ لای خۆی ڕاکێشاو توانی سوپایەکی بەهێز پێکبهێنێت، سەرەتا دەستیان کرد بە ڕاهێنانێکی سەختو بەهێز؛ بۆئەوەی جەنگاوەرانی سوپاکەی توانایان زۆر لە سەروو توانای جەنگاوەرێکی ئاساییەوە بێت، هەموو جار دڵنیای دەکردنەوە، کە سوپایەکی ئامادەکراوو بەهێز، توانای سەرکەوتنو خۆڕاگریی زیاتری هەیە، تیمۆژین توانی هۆکارەکانی جەنگو چەكو کەرەسەی جەنگی ئەو کات بۆ سوپاکەی ئامادە بکات، سەرجەم ئەفسەرانی سوپاکەی لەسەر بنەمای لێهاتوویی‌و بەهێزی دیاری دەکرد، نەك لەسەر بنەمای نزیکی‌و خۆشەویستیان بۆ بنەماڵەکەی. ئەمەش وای کردبوو، کە ئەفسەرانی سوپاکەی زۆر دڵسۆز بن، بۆ تیمۆژینی سەرکردەیان.

دوای ئەوەی تیمۆژین توانی جڵەوی سەرکردایەتیی هۆزەکەی بگرێتەوە دەستو سوپایەکی بەهێزی مەشقپێکراو درووست بکات، ئیدی دەستی کرد بە جێبەجێکردنی پلانەکەی، سەرەتا دەستیکرد بە فراوانکردنی خاکی ژێر دەسەڵاتی، ئەویش لەسەر حسابی دراوسێکانی، توانی دەست بگرێت بەسەر ناوچەیەکی گەورەی مەنگۆلیادا، ساڵی ١٢٠٣یش عەشیرەتی "کەراییت"ی مەگۆلیی تێکشکاند، شاری قەرەقوومی داگیر کردو کردی بە پایتەختی دەسەڵاتی خۆی. دواتر سەرۆك عەشیرەتەکانی دیکە، پابەندبوونی خۆیان بە تیمۆژینەوە ڕاگەیاند.

لە ئابی ساڵی ١٢٠٦، بووە فەرمانڕەوای وڵاتی مەنگۆلیا، هەر لەو ساڵەدا، نازناوی سەرۆکی هۆزەکانی پێبەخشرا، (جەنگیزخان)، کە بە مانای فەرمانڕەوای گشتی دێت.

لەو کاتەدا جەنگی لەگەڵ هۆزی تارتاردا ئەنجام دا، ئەو هۆزەی کە باوکیان دەرمانخوارد کردبوو، جەنگیزخان هیچ ڕەحمو سۆزێکی پێنەکردن، سەرجەمی پیاوەکانی ئەو هۆزەی

# جەنگیزخان

## ١١٦٢-١٢٢٧



ئالانی

کوشتو تەنها منداڵو ژنانی هێشتەوە، ئەوانیشی بەدیل گرتو کردنی بە کۆیلە، بەمەش کۆتایی بە هۆزی تارتار هێنا!

لە ساڵی ١٢١٨ جەنگیزخان، بەرەو مەملەکەتی خوارزم واتە: ئۆزبەکستانو تورکمانستانی ئێستا، بەڕێکەوت، ساڵی ١٢٢٠ هەردوو شاری (بوخاراو سەمەرقەند)، کە ئێستا لە ئۆزبەکستانن، لەگەڵ نەیسابوور لە ئێران وێران کرد، هەروەها هێرشی کردە سەر دوو سوپای بچووك، کە سەر بە دەشتی باکووری قەزوین بوون، لە کۆتایی ساڵی ١٢٢٢ دەستی گرت بەسەر کبتشاکس، هەروەها سوپای ڕووسی، لەسەر ڕووباری کلکا تێشکاند.

پاشان جەنگیزخان خۆی بە دەستبەسەراگرتنی وڵاتی چین ئامادە کرد، سەرەتا دەستی بەشەڕکردن کرد لەگەڵ بەشی ڕۆژئاوای وڵاتی چین، پاشانیش جەنگی لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی چیندا کرد، خان توانی دەست بەسەر پەکیندا بگرێت، کە پایتەختی ئیمپراتۆریەتی (جن تشن) بوو.

ساڵی ١٢٢٥ جەنگیزخان هێرشی کردە سەر هۆزی (زی زیا)، ئەو هۆزە هۆزێکی گەورە بوون، ژمارەی ئەندامانی هۆزەکە نزیکەی پێنج ملیۆن کەس بوو، لە هەمان کاتدا خاوەنی سوپایەکی زەبەلاح بوون، بەڵام سوپاکەیان بەشێوەیەکی باش ڕانەهێنرابوو، زانیارییان لەبارەی شێوازەکانی جەنگو فێڵو تەڵەکەی جەنگی نەبوو، لەبەرئەوە کاتێك ڕووبەڕووی سوپای بەهێزی جەنگیزخان بوونەوە، پەنایان برد بۆ چیا بەرزەکانی ناوچەکەیان، سوپاکەی جەنگیزخان نەیاندەتوانی پێشڕەوی بکات بۆ سەر چیاکە، لەبەر سەختیی چیاکە، لەبەرئەوە جەنگیزخان پەنای برد بۆ فێڵێکی جەنگی، فەرمانی کرد سوپاکە بکشێنەوەو وا خۆیان دەربخەن، کە شکاون لە جەنگ بەرامبەر سوپای زی زیا؛ بۆئەوەی سوپای بەرامبەر لە قەڵاو شوێنە بەرزەکانی چیاکە بێنە دەرەوەو بە دوای سوپای جەنگیزخان بکەون، کاتێك ئەم سوپایە وایان زانی سوپاکەی جەنگیزخان لە هەڵاتندانو پاشەکشەیان کردووە، هاتنە دەرەوەو دوایان کەوتن، کاتێك خۆیان بینییەوە کەوتنە نێو بۆسەی سوپاکەی جەنگیزخانەوە، کە وەکو تەرزە، تیربارانیان کردن، زۆربەی زۆری سەربازەکانیان کوژران، دواتر توانیان سەرکردەی سوپاکە بەدیل بگرن، سەرکردەکەیان بردە لای جەنگیزخان، ئەویش داوای ڕێکەوتنی لێکردنو پێشنیاری کرد، کە جەنابی جەنگیزخان هاوسەرگیری لەگەڵ کچەکەیدا بکات، بەم شێوەیە ئەم هۆزەش هاتنە ژێر ڕکێفی ئیمپراتۆری جەنگیزخانەوە.

دوای ئەوەی جەنگیزخان بووە سەرکردەی گشتیی سەرجەم هۆزەکانی مەغۆلو سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکانی، هەڵسا بە چەند کارێکی گرنگ، وەکو دابەشکردنی ئەرکەکان بەسەر جێگرەکانیدا، چ کاروباری شارستانی بێت، یان سەربازی، دیاریکردنی لیژنەیەك بۆ چاودێریکردنو دڵنیابوون لە جێبەجێکردنی فەرمانەکان، هەروەها دیاریکردنی کۆمەڵێك پاسەوانی تایبەتو بەهێز بۆ پارێزگاریکردن لە جەنابی جەنگیزخان، کە ژمارەیان نزیکەی دە هەزار سەرباز بوو، هەروەها پارێزگاریکردن لەو بارمتانەی کە لە خێزانە بەهێزەکانو خاوەنی جەماوەری زۆرن، هەروەها هانی گەلەکەی دا؛ بۆ گرنگیدان بە خوێندنەوەو نووسین، یەکەم دەستووری یاسای مەنگۆلی دامەزراند بەناونیشانی یاسا، یان یاسالك، کە لە چەند بڕگەیەك پێکهاتبوو.

بەپێی گێڕانەوەیەك، مەنگۆلەکان شاری یەنشوانی پایتەختی تانگوتی چینی گەمارۆ دەدەن. پاشا لی شیانو سوپاکەی بەرگرییەکی سەخت دەکەنو جەنگیزخان بەمە زۆر تووڕە دەبێت. لی شیان تێدەگات بەرگریکردن لەبەرامبەر مەنگۆلەکان بێسوودە، بۆیە ئامادە دەبێت بەمەرجی پاراستنی ژیانی خۆیو خەڵکی شار، خۆی بەدەستەوە بدات. جەنگیزخانیش بەڵێنی پێ دەدات، بەڵام خانی مەنگۆل نەخۆش دەکەوێتو هەست بە نزیکبوونەوەی مەرگی خۆی دەکات. بۆیە فەرمان بۆ سەرکردەکانی سوپا دەردەکات، هەواڵی نەخۆشکەوتنی پەردەپۆش بکەنو وەسێت دەکات ئەگەر مرد، لی شیانو خەڵکەکەی بکوژرێن. دوای ٨ ڕۆژ نەخۆشی، جەنگیزخان دەمرێت.

هەرچەندە گۆڕەکەی جەنگیزخان ڕای جیاوازی لەسەرەو هەندێك پێیان وایە جەنگیزخان بەشێوەیەکی نهێنی بە خاك سپێردراوەو تا ئێستا ئەو نهێنییە ئاشکرا نەبووە، بەڵام هەندێك لە مێژوونووسان پێیان وایە، لە حەدیسە بووە لە ئەردوسی، پاشان تەرمەکەی گوزاروەتەوە..

(ڕەشیدەدین فەزڵوڵڵا)ش لە کتێبی "جامع التواريخ"دا دەنووسێت: گۆڕی جەنگیزخان لە چیای بەرخان خەلدوونە، لەو شوێنەی ڕووبارەکانی ئۆنۆنو کۆرلینی لێ هەڵدەقوڵێن. بەپێی گێڕانەوەیەکی دیکە، جەنگیزخان وەسێتی کردووە، کوڕە خۆشەویستەکەی: تۆلۆی خان، شوێنی بە خاکسپاردنی باوکی هەڵبژێرێت. ئەویش تەرمەکەی بردووەو لەژێر دارێکدا لە قەرەقووم ناشتوویەتیو کۆمەڵێك چەکداری عەشیرەتی قیات، ساڵانێکی زۆر پاسی شوێنی گۆڕەکەیان کردووە. دواتر ژمارەی دارەکان زیادی کردووەو شوێنی گۆڕەکە دیار نەماوە.

بەم جۆرە دەوڵەتی مەغۆل توانییان زۆرێك لە دەوڵەتانی سەرزەوی داگیر بکەن، ئیمپراتۆرەکەیان سەدان ساڵ درێژەی کێشاوە، تەنانەت ماوەیەکی زۆر، حوکمی وڵاتی هیندیان کردووە، تا ئەو کاتەی بەریتانیا، هیندی داگیر کردووەو کۆتا پاشای مەغۆلییەکانی لا بردووە.

ماوەتەوە بڵێین: جەنگیزخان سەرەڕای ئەوەی لە ڕووی سەربازییەوە، واتە: ڕەفتارەکانی بەرامبەر بەو سوپایانەی جەنگی لەگەڵدا کردوون، وەحشییانەو دڕندانە بووە، بەڵام مێژوو خاڵی نییە لە دەستکەوتەکانیو ئەو شارستانیەتەی کە جەنگیزخان بەدەستی هێناوە بۆ گەلەکەی، لە کاتی هێرشە سەربازییەکانیدا بۆ سەر ڕۆژئاوا، ئەم چوار داهێنانە گەورەیەی گواستۆتەوە بۆ ڕۆژئاوای ئاسیاو ئەورووپا (کاغەز، چاپ، بارووتو قیبلەنما)، لە هەمان کاتدا، شارستانیەتی ڕۆژئاوای پێشکەشی وڵاتی چین کردووە، هەروەها بازرگانی لە نێوان چینو ئەورووپادا، بەشێوەیەکی بەرچاو پێشخستوە.

لە کۆتاییدا دەتوانین بڵێین: جەنگیزخان، ئەو سەرکردەیەی گەورەترین هێرشی سەربازی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ئەنجام داوە، هەروەها گەورەترین ئیمپراتۆری دامەزراندووە، کە هەموو مرۆڤایەتی پێی ئاشنایە.

بەکورتی: باسکردنی ژیانی جەنگیزخان، مەبەست ئەوە نییە کارە دڕندانەکانی ئەو سەرکردەیە، بەچاك بزانرێتو وەکو نموونە بهێنرێتەوە، نەخێر بەڵکو مەبەستمان لە باسکردنی ئەم سەرکردەیە ئەوەیە، کە وەکو منداڵێکی بێباوك توانیویەتی گەورەترین گۆڕانکاری لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دروست بکات، توانیویەتی بەسەر کۆسپو تەگەرەکانی ژیاندا سەر بکەوێتو سوپایەکی کەموێنەو زەبەلاح دروست بکاتو ئیمپراتۆریەتێکی بەهێز دابمەزرێنێتو شارستانیەتیی وڵاتەکەی پێش بخات. کەواتە: با سوود لە خاڵە بەهێزەکانی ئەم سەرکردەیە وەربگرینو لە خاڵە نەرێنیو قێزەونەکانیش، خۆمان بەدوور بگرین.

جەلال عەبدوڵا حاجی

بەشی دووەم و کۆتایی

پیسبوونی هەوا، کاریگەریی ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر زیندەوەران بەگشتی؛ چونکە لە ئەنجامی هەڵمژینەوە، کاریگەری جێ دەهێڵێت، بۆ نموونە: گازی یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن (CO)، دەبێت بەهۆی نەخۆشییەکانی دڵ، گازی ئۆزۆن لە ئاستی ڕووی زەوی ($O_3$)، دەبێت بەهۆی تەنگەنەفەسی و نەخۆشییەکانی کۆئەندامی هەناسە، فورقوشم (Pb) کار لە کۆئەندامی دەمار دەکات، دەبێت بەهۆی کەمکردنەوەی زیرەکی، کەمخوێنی و چەندین کێشەی دیکە، دوانۆکسیدی نایترۆجین ($NO_2$) دەبێت بەهۆی کێشەی هەناسەدان و خێرا تووشبوونی نەخۆشی، لە کاریگەرییە ناڕاستەوخۆکانی پیسبوونی هەوا:

**١- ترشە باران:**

دوای ئەوەی ماددە پیسکەرەکان، دەچنە هەواوە، لەگەڵ شێ و هەڵمی ئاو کارلێك دەکەن، وەك کارلێکی گازی دوانۆکسیدی گۆگرد، لە ئەنجامدا ترشی گۆگردیك دروست دەبێت، تێکەڵ بە هەور دەبن، پاشان ترشەکە لەگەڵ باراندا دێتە خوارەوە، دڵۆپەی ئەم بارانە ترشە، ئەم ترشەبارانە بەسەر هەر ناوچەیەکدا ببارێت، توانای لەناوبردنی ڕووەکی هەیە، دەبێت بەهۆی مردنی گیانلەبەران، بەتایبەتی ماسی.

ترشەباران گەڵای ڕووەکان لەناو دەبات. کاتێکیش دەچێتە ناو خاکەوە، دەبێت بەهۆی گۆڕینی کیمیای خاك، وا دەکات زیندەوەرە بچووکەکانی ناو خاکەکە، ئیدی نەتوانن لەو خاکەدا بژین، لەکاتێکدا ئەم زیندەوەرە بچووکانە، زۆر پێویستن بۆ خاکەکە؛ چونکە خۆراکی پێدەدەن.

**٢- ئۆزۆن لەئاستی ڕووی زەوی:**

پیسکەرەکانی هەوا، کارلێکی کیمیایی دەکەن و چینێك ئۆزۆنی ژەهراوی دروست دەکەن ($O_3$)، ئۆزۆن گازێکە، دەتوانێت کار لە تەندروستیی مرۆڤ بکات، هەروەها دەتوانێت زۆر ڕووەك و گیانەوەر لەناو ببات.

**چۆن ڕێگری بکەین لە پیسبوونی هەوا؟**

چارەسەرکردنی پیسبوونی هەوا زۆرگران و قورسە، بۆیە ڕێگریکردن لە پیسبوونی، باشترین چارەسەرە. دەکرێت ئەم ڕێگریکردنەش لەلایەن حکومەتەوە بێت (بە دەرکردنی یاسا)، یان بەهۆی هەوڵی تاکەکەسەوە. بۆ ئەم مەبەستەش لە زۆربەی شارەگەورەکانی دونیادا، ئامێری تایبەتی دانراوە بۆ چاودێریکردنی جۆری هەوا (کوالێتی).

**ڕێگریکردن لە پیسبوون لەسەر ئاستی حکومەت، (یان ڕێکخراوەکان):**

+ زۆر لە وڵاتان دەستیان کردووە بە ڕێگریکردن لە پیسبوونی هەوا، لە ڕێگەی بەکارهێنانی وزەی سەوزەوە، سوود لە وزەی با و وزەی خۆر وەردەگرن، سەرەڕای بەکارهێنانی وزەی نوێبووەوەی دیکە، بۆ ڕێگریکردن لە بەکارهێنانی نەوتی خاوو خەڵووزی بەردین؛ چونکە هۆکاری پیسبوونی هەوان.

+ وڵاتان کۆمپانیاکان ناچار دەکەن، زیاتر بەرپرسیاربن بەرامبەر کارە پیشەسازییەکانیان، هەرچەندە بەردەوامن لە پیسکردنی ژینگە، بەڵام لەژێر چاودێریدان. کۆمپانیاکانی دروستکردنی ئۆتۆمبێلیش، ئۆتۆمبێلێك دروست دەکەن بە سووتەمەنییەکی کەمتر کاربکات.

**ڕێگریکردن لەسەر ئاستی تاکەکەس:**

+ ماڵەوەتان هان بدە؛ بۆئەوەی پاس، شەمەندەفەر، یان پاسکیل بەکار بهێنن. ئەگەر هەموومان ئەم کارە بکەین، ئەوا ژمارەی ئۆتۆمبێلەکان لە شەقامەکاندا کەم دەکەینەوە، هەروەها دووکەڵێکی کەمتر دەکرێتە ژینگەوە، بەم شێوەیە هەوای شارەکەمان، خاوێنتر دەبێت.

+ بە گوێرەی پێویست وزە بەکار بهێنە: (ڕووناکی، ئاو، بۆیلەر، کتری و داری سووتەمەنی)؛ چونکە بڕێکی زۆر سووتەمەنی، بەکار دێت بۆ بەرهەمهێنانی کارەبا، بەم کارەی ئێمە، بڕی سووتەمەنی بەکارهاتوو کەم دەکەینەوە، هەوا کەمتر پیس دەبێت.

+ دووبارە شتەکان بەکار بهێنەرەوە، بەم جۆرە پشتبەستن بە بەرهەمهێنانی تازە کەم دەکەیتەوە، لەبیرت بێت پیشەسازی، زۆر ژینگە پیس دەکات، ئەگەر بتوانین کیسەی نایلۆن، جلو بەرگ، کاغەزو شووشە بەکار بهێنینەوە، دەتوانین یارمەتیی ژینگە بدەین.

**پیسبوونی هەوای ژوورەوە:**

مەبەست لە هەوای ژوورەوە، هەوای ناوەوەی بیناکانە، وەك ماڵەوەتان، پۆل، فەرمانگە، مۆڵ و سەنتەرە بازرگانییەکان، نەخۆشخانە، یان هۆڵەکانی وەرزشکردن، ئێمە دەڵێین: «پیسبوونی هەوای ژوورەوە» ئەگەر هەوای ژوورەوە پیس بووبێت بە دووکەڵ، مادەی کیمیایی، بۆن و تەپوتۆز.

جیاواز لە هەوای پیسبووی دەرەوە، کاریگەریی هەوای پیسبوو لە شوێنە داخراوەکاندا، زۆرترە لەسەر تەندروستیی مرۆڤ، لە ناوچە ساردەکاندا، بیناکان بەجۆرێك دروست دەکرێن، گەرمی نەچێتە دەرەوە، دەرگاو پەنجەرەکان داخراون، کەمترین هەواگۆڕکێی تێدایە؛ بۆئەوەی ناو بیناکە سارد نەبێتەوە، زۆرجار ئەو مادەیەی بیناکەی لێدروست کراوە، بۆن و بەرامەی ژوورەوە، مادە کیمیاییەکانی کە لە کەلوپەلی ماڵەوە دەردەچن، دزە دەکەنە ناو هەوای ژوورەوە، هەوای خاوێنیش نایەتە ژوورەوە، چڕبوونەوەی پیسکەرەکانی وەك دووکەڵی جگەرە، قڕکەری مێروو، گەنین، گازی ڕادوون، یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن ..هتد، لە ژوورەوە قەتیس دەبن و خەڵکی ناو بیناکە هەڵی دەمژن و تووشی نەخۆشی دەبن.

وەرگیراوە لە سایتی: http: //www.eschooltoday.com

# کاریگەرییەکانی پیسبوونی هەوا





# ڕۆزا پارکس ١٩١٣ - ٢٠٠٥

بەرزان نەبەبەکر

**ڕۆزا پارکس، ئەو بەرگدرووەی کە توانی ئەمریکا بگۆڕێت!!**

هیچ ئەمریکییەك نییە، ڕۆزا پارکس نەناسێت، ڕۆزا پارکس ئەو ئافرەتەی توانی بە تەواوی ژیانی کۆمەڵایەتیی ئەمریکییەکان بگۆڕێت، بە هۆی سووربوونی بۆ وەرگرتنی مافی ڕەوای ڕەشپێستەکان، لەو کاتەی کە دژایەتییەکی بەهێزی ڕەشپێستەکان دەکرا لە ئەمریکادا، ئەو کاتەی جیاوازییەکی گەورە هەبوو لە نێوان ڕەشپێستو سپی پێستدا، بەجۆرێك ڕەشپێستەکان بە چاوێکی سووك سەیر دەکرانو مافو ئیمتیازاتی هاوڵاتی پلە دووشیان نەبوو، لەو ئەمریکایەی ئێستا سەرکردایەتیی جیهان دەکات، ئێمە باس لە مێژوویەکی دووری ئەمریکا ناکەین، تەنها پەنجا ساڵ لەمەوبەر، لە ئەمریکادا ڕەشپێستەکان دەچەوسێنرانەوە، ستەمیان لێ دەکرا، لەسەر زۆرێك لە چێشتخانەکانیان نووسرابوو، هاتنەژوورەوە بۆ سەگو ڕەشپێست نییە!

ڕۆزا پارکس بووە سومبولێکی مێژوویی، بۆ بەدەستهێنانی ئازادیو سەربەستیو ڕیشەکێشکردنی ڕەگەزپەرستیو جیاوازی چینایەتی، بەشێوەیەك ژیاننانەمەی ڕۆزا پارکس، چەندین کتێبو فیلمو وتاری لە بارەوە نووسرا، ئێستا با بزانین ڕۆزا پارکس کێیە؟

ڕۆزا پارکس لە ٤/فبرایری ساڵی ١٩١٣ لە شارۆچکەی (توسکیج) لە ویلایەتی ئەلباما، لە باشووری ئەمریکا لە باوکێکی دارتاشو دایکێکی کارگوزار، لەدایکبووە، کاتێك دایكو باوکی لە یەك جیابوونەوە، لەگەڵ دایکیو برا بچووکەکەی گەورەبوو..

پارکس پەیوەندیی کرد بە قوتابخانەوە، تا ئەو کاتەی تەمەنی گەیشتە یانزە ساڵی، لە یانزەساڵیدا ناچاربوو، واز لە خوێندن بهێنێتو ڕوو لە کارکردن بکات، لەبەرئەوەی دایکی دوچاری نەخۆشی هات. ڕۆزا زۆر کاری کردووە، سەرەتا لە کاری ناومالڵو هاوکاریی نەخۆشخانەکانەوە دەستی پێکردووە..

پارکس لە ساڵی ١٩٣٢ هاوسەرگیری کرد لەگەڵ (رایموونـد پارکس)، هاوسەرەکەی کاری دەلاکی دەکردو هاوکات ئەندامی هەمان ئەو ڕێکخراوە بوو، کە ڕۆزا کاری تێدا دەکرد، بۆ بەدەستهێنانی مافە ڕەواکانی ڕەشپێستەکان..

پارکس بە هۆی پێداگریی هاوسەرەکەیەوە، گەڕاوەتەوە بۆ خوێندنو ساڵی ١٩٣٣ قۆناغی ئامادەیی تەواو کردووە، بەڵام نەچووە زانکۆ؛ چونکە زیاتر حەزی بە کاری بەرگدروویی دەکردو وەکو بەرگدرووی پۆشاك دەستی بە کارکردن کرد.

ساڵی ١٩٤٣ ڕۆزا پارکس بووە یەکێك لە چالاکوانی مافە مەدەنییەکان، بۆ ئەو مەبەستە چووە ڕیزی (پەیوەندیی نیشتمانی بۆ بوژاندنەوەی ڕەشپێستان)، کە تاکە ئافرەت بوو لەو ڕێکخراوەدا کاری دەکرد، ڕۆزا بەردەوام بوو لە چالاکیو کارکردن، تا ئەو کاتەی بوو بە سکرتێری (ئیدجر نیکسون).

ڕۆزا بەردەوام هەوڵی دەدا بۆ بەدەستهێنانی یەکسانیو دادپەروەری لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگەدا..

**بارودۆخی ئەو کاتی ڕەشپێستەکان لە ئەمریکا:**

لەو ساتەوەختەدا، چوار ڕیزی یەکەمی هەموو پاسێك تەرخان کرابوو، بۆ سپیپێستەکان، بەشی دواوەش تەرخان کرابوو بۆ ڕەشپێستەکان، کە ئەوکات نزیکەی سەدا ٧٥٪ ئەو کەسانەی

بە پاس هاتوچۆیان دەکرد، ڕەشپێستەکان بوون. لەو کاتەدا ڕەشپێستەکان بۆیان هەبوو، لە ڕیزی ناوەڕاست دابنیشن، بەڵام بە مەرجێك سپیپێستێك دابەزێت، ئەو بچێتە شوێنەکەی!

**ئەو ڕۆژەی هەڵوێستی پارکس ئەمریکای گۆڕی:**

لە یەکی دیسەمبەری ساڵی ١٩٥٥، ئەو کاتەی پارکس تەمەنی ٤٢ ساڵ بوو، پارکس لە وێستگەیەکدا، چاوەڕوانی هاتنی پاس بوو، پاسێك کە لە شارۆچکەی موونتجومری بەڕێ کەوتبوو، لە وێستگەکەدا وەستا، پارکس سەرکەوتە بەشی پشتەوەی پاسەکە، کە بۆ ڕەشپێستەکان تەرخان کرابوو، بەڵام لەو بەشەدا هیچ جێگەیەکی خاڵی نەبوو، لەبەرئەوە چووە ناوەڕاستی پاسەکەو لە کورسیەکی خاڵیدا دانیشت، دوای ماوەیەك پاسەکە لەوێستگەیەکی پاسدا ڕاوەستا؛ بۆئەوەی چەند کەسێکی سپی پێست سەر بکەون، لەو کاتەدا شۆفێری پاسەکە، دەنگی بەرزکردەوەو هاواری کرد ڕەشپێستەکان بۆ دواوە!

لەو کاتەدا چوار لە ڕەشپێستەکان، کە لە کورسییەکانی ناوەڕاستدا دانیشتبوون، هەستانو شوێنەکانی خۆیان چۆڵ کردو ڕۆیشتنە بەشی پشتەوەی پاسەکە، بەڵام ڕۆزا پارکس هەڵنەساو نکوڵی کرد لەوەی جێگەکەی خۆی چۆڵ بکات؛ تا سپیپێستێك لێی دابنیشێت، سەبارەت بەو ڕووداوە، پارکس دەڵێت: کاتێك پیاوێکی سپیپێست، منی بینی لە کورسی ناوەڕاست دانیشتووم، داوای لێکردم کورسییەکەی بۆ چۆڵ بکەم؛ تا ئەو دابنیشێت، پێم گوت: نەخێر شوێنی خۆمەو چۆڵی ناکەم بۆ تۆ!

ئەویش پێی گوتم: ئەگەر کورسییەکە چۆڵ نەکەیت، ئەوا پەیوەندی بە پۆلیسەوە دەکەم، تا دەستگیرت بکەن، (چونکە ئەو کاتە ئەوە یاسا بوو، ئەگەر سپیپێستێك بهاتایەتە نێو پاسەوە، ڕەشپێست بۆی نەبوو، لەو شوێنە دابنیشێت، واتە: سەرپێچیی یاسای دەکرد، ئەگەر کورسییەکەی خۆی بۆ چۆڵ نەکردایە)، ڕۆزا دەڵێت منیش پێم گوت: دەتوانی ئەو کارە بکەیت، واتە: بانگی پۆلیس بکە.

ئیدی پاسەکە بە نەفەرەکانەوە ڕووی کردە بنکەیەکی پۆلیسو سکاڵایان لە دژی من تۆمارکرد، پۆلیس منیان دەستگیر کرد، بە تۆمەتی سووکایەتی بە یاسای هاتووچۆ، ئەم هەواڵە لە نێو شاردا بە خێرایی بڵاوبووەوە، ڕەشپێستەکانی شار، هەموو کۆبوونەوە بۆ بەرگریکردن لە ڕۆزا پارکس، ئەو ئافرەتەی ئەمڕۆ بووەتە هێمای سەربەستی بۆ ئەمریکییەکان! بە سەرۆکایەتی مارتن لۆسەر کینگ، کە بوون بە هێمای دژایەتیکردنی ڕەگەزپەرستی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا!

لە ڕۆژی دەستگیرکردنی پارکسەوە، سەرجەم ڕەشپێستەکان مانیان گرتو بڕیاریان دا هیچ جۆرە هۆکارێکی گواستنەوەی گشتی بەکار نەهێنن، ئەم مانگرتنەو بەکارنەهێنانی هۆکارەکانی هاتوچۆ، تا ٣٨١ ڕۆژی خایاند، دواجار هەوڵەکانیان سەرکەوتووبوو، هێرشی دژی ڕەگەزپەرستی لە تەواوی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، بە تەواوی پەرەی سەندو گەیشتە لوتکە، تا دواجار یاسای سەربەستی شارستانی دەرچوو، کە جیاکاریی مرۆڤەکانی بە هۆی ڕەنگی پێستەوە قەدەغە کرد، لە ئەمریکادا.

گەر وربینەوە هەست دەکەین چەند ساڵێکە لە ئەمریکا، جیاکاریو ڕەگەزپەرستیو چەوسانەوەی مرۆڤ، لەسەر بنەمای ڕەنگ قەدەغەکراوە!

بەهۆی ئەو ڕووداوەوە پارکس کارەکەی لەدەست دا، لەبەرئەوە ناچاربوو لە ساڵی ١٩٥٧ بگوێزێتەوە بۆ دیترویت، لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٧-١٩٨٨ چووە پاڵ دەستەی فەرمانبەرانی جۆن کنیزری، کە یەکێك بوو لە ئەندامانی دیموکراتەکان، لە نێو کۆنگرێسی ئەمریکی.

پارکس دەڵێت: ناوبانگی من هۆکاری ڕاستەقینەی ئەو هەڵنەستانەی ناو پاسەکەبوو، کە ئەو کات هەستم کرد، کە ئێمەش وەك هەر کەسێکی دیکەی سپیپێست مافی دانیشتنمان هەیە، بەڵام بەداخەوە ساڵانێك بوو ئێمەی ڕەشپێست، بەهۆی جیاوازیی ڕەگەزپەرستییەوە دەمانناڵاند.

**خەڵاتەکانی ڕۆزا پارکس:**

* پارکس ساڵی ١٩٧٩ مەدالیای سبنجارنی بەدەست هێنا، بەهۆی هەوڵو تێکۆشانەکانی لە پێناوی بەدەستهێنانی مافە شارستانییەکانی هاوڵاتیانی ئەمریکی.
* پارکس ساڵی ١٩٩٦، خەڵاتی سەرۆکایەتی بۆ سەربەستی بەدەست هێنا.
* هەروەها خەڵاتی ئاڵتوونی کۆنگرێسی ئەمریکی، ساڵی ١٩٩٩ بەدەست هێنا. کە بەرزترین ڕێزلێنانی شارستانی بوو، لەسەر ئاستی وڵات.

**کۆچی دوایی ڕۆزا پارکس:**

سەرۆکی مافەکانی شارستانییەت (ڕۆزا پارکس) لە ٢٤/ ئۆکتۆبەری /٢٠٠٥ لە تەمەنی ٩٢ ساڵیدا ماڵاوایی لە ژیان کرد، پارێزەرەکەی دەڵێت: ڕۆزا پارکس لە کاتی خەوتندا لە ماڵەکەی خۆی لە شاری دیترویت، لە ویلایەتی میشیغان کۆچی دوایی کردو چاوەکانی بۆ هەمیشە لێکنا. تەرمەکەی لە گۆڕستانی تایبەت بە خاك سپێردرا، کە تا بە خاکسپاردنی پارکس، یەکەم ئافرەت بوو لەو گۆڕستانەدا بەخاك بسپێردرێت، دووەم کەسی ڕەشپێست بوو، هەروەها یەکەم هاوڵاتی ئەمریکی بوو، کە بەرپرسی حکومی نەبوو، لەو گۆڕستانەدا بەخاك بسپێرێت، لە کاتی ناشتنی پارکسدا، وەکو ڕێزێك ئاڵای ئەمریکایان داگرت، کە ژمارەیەکی زۆر لە هاوڵاتیانی ئەمریکی ئامادەی بەخاکسپاردنی بوون..

بەرهەمی هەوڵو تێکۆشانەکانی ڕۆزا پارکسو هاوڕێکانی بوو، کە ماوەی دوو خولە ڕەشپێستێك سەرۆکایەتی ئەمریکا دەکاتو لە ئێستادا هیچ جیاوازییەك ناکرێت لە نێوان چینو توێژەکانی کۆمەڵگەی ئەمریکیدا، ڕۆشنبیریو ئاستی تێگەیشتنی تاکەکانی ئەمریکا، گەیشت بە ئاستی یەکتر قبووڵکردنو پێکەوە ژیانو وەلانانی دووبەرەکی نێوانیان، یاساکانی ژیان لەو وڵاتەدا بۆ هەمووانەو کەس هاوڵاتی پلە دوو نییە لەو وڵاتە! هیوادارم ڕۆژێك دابێت، لەم کوردستانەی ئێمەدا تەبایيو خۆشەویستیو برایەتی بەرقەرار بێتو دووبەرەکیو ناکۆکی لەسەر بنەمای حیزبایەتی، لە ڕەگەوە ڕیشەکێش بکرێت!

تێبینی: ئەو پاسەی کە ڕووداوەکەی تێدا ڕوویداوە، ئێستا لە مۆزەخانەی هێنری فۆردە، کە بە بڕی٤٩٢٠٠٠ چوار سەدو نەوەدو دوو هەزار دۆلار فرۆشراوە بە مۆزەخانەی هێنری فۆرد.

له سـەردەمێکداین، تەنانەت مرۆڤبوونیش توانا و شەهامەتی خـۆی دەوێـت، چ جا بگاتــە میهرەبان بـوونو سـەرکەوتن لەو میهرەبانییـەدا، ئەمـە بە مانای ئـەوە نا، کە چاوەڕێی پاداشـت بکەیت لە بەرامبەر نواندنـی میهرەبانیدا؛ چونکە ئەوە بۆ خۆی شکاندنی بنەماکانی میهرەبانییە، بەڵکو بەو مانایەی کە لانی کەم میهرەبانییەکـەت، نەبێتە مایەی ئازارو نەهاماتی بۆتو بەرامبەر بتخاتە نێو خانەی مرۆڤە نەفامەکانەوەو میهرەبانییەکانت چەواشە بـکات بۆ مەرامەکانی خۆی، دواتریش ئازارو کێشـەی جۆراوجۆر بکاتـە دیاری بـۆت!! کورتەی ئەمەش واتـە: میهرەبانی هەتا ئەو ڕادەیە نموونەی مرۆڤایەتییە، کە لە مرۆڤایەتیت نەخات.

لە ڕاستیدا لەم ڕۆژەدا، جوانی یەکێکە لە هۆکارەکانی بەدبەختی، مرۆڤ عاشـقی جوانییەو دڕندەی جوانیشە، عاشقیەتی هەتا ئەو کاتەی بەدەسـتی دەگات، هەر کاتێکیش بەدەستی هێنا، دەبێت بە دڕندەیەكو ئەگەر ناشیرینی نەکات دڵی تێر ناخوات لە ئاوی ڕەش.. بەڕاسـتی ئەرکێکی زۆر قورسە، جوان بیتو بشتەوێت سەرکەوتوو بیتو خاوەن ڕێزو ڕەوشـتیش بیت لـە هەمان کاتدا؛ چونکە ئەو کاتە نەخۆشـەکان، وەك خوێنمژ لە هەموو لایەکەوە هێرشـت بۆ دەهێنـن، ئەمەش وەك باجی هەموو ئەو سـیفەتە جوانانەیە، کە لە تـۆدا کۆبوونەتەوە!! بۆ نموونە: کاتێك لەنـاو هاوڕێکانتدا تۆ دەبیـت بە نموونەی خانمێکـی جوان، ئەوا هەموویان ئیرەیت پێ دەبـەنو ئامادەن هەموو قسـەیەك بکەن، تەنها بـۆ ئازاردانی تۆ! بۆچی ئەم کارەش دەکەن؟ چونکە دەروونیان دەشێوێت بە بینینی شـتی جـوان! ئەم جـۆرە دەروونانە هەموو شـتە جوانەکان ڕەت دەکەنـەوە، تەنها لە یەك حاڵەتـدا نەبێت، کاتێك خۆیان خاوەنی ئەو جوانییە بن! کاتێك لە ناو هاوپیشـەکانتدا تۆ باشـترینیتو بەردەوام چالاکیو بەرهەمەکانت دەبینرێتو دەبیت بە کەسـێکی پێویسـت بۆ شوێنەکەت، هاوکارەکانت دیسان ئیرەییت پێ دەبەنو دەخوازن کە ڕۆژێك بێ تۆ بەسەر بەرن، هەموو شتێك دەکەن؛ بۆ ڕووخانی تۆو ئەگەر سـەرکەوتووش نەبـن، ڕقەکە زیاتر دەبێت!! بەڕاسـتی ئێمە بوونەوەرێکی نەخۆشین.. لە جیاتی دڵخۆشبین بە شـتە باشـەکان، ئیرەییان پێ دەبەین! لە جیاتی خۆشحاڵ بین بە درووسـتکردنی پەیکەرە مەزنەکان، تێکیان دەشـکێنین، لە جیاتی ئەوەی دەستخۆشـی لە پاڵەوانەکانمان بکەیـن، خاڵە لاوازەکانیان دەخەینە ڕوو، دڵمان توند دەبێت بە بینینی هەر کەسێکی جوانو لێهاتـوو و بەتوانا، کە ئەمانە هەموویان نەخۆشـینو هەمووشـی سـەرچاوەکەی لـە لاوازی خۆمانەوە درووسـت دەبێـت؛ چونکە لـە ڕاسـتیدا، هیچ جیاوازییـەك نییە لە نێوان منێکی ئاسـاییو پاڵەوانێکـی ناسـراودا، تەنها ئـەو بەهۆی بەکارهێنانی مێشـكو تواناکانییەوە گەیشـتۆتە ئەو ئاسـتەو ڕێگەی بەخۆی نەداوە، کە کاتـی هەبێـت بۆ ئیرەییبردن بە کەسـانی دی، بەڵکو ئەو کاتەی

# با خاوەنی دڕکیش بیت!!

شناویا محەمەد



من بەکاری دەهێنم لە بیرکردنەوە لە شتە باشەکانی خەڵکو ئیرەیی پێبردنیانو هەوڵدان بۆ ناشرینکردنیان، ئەوان بەکاری دەهێنن بۆ ئەنجامدانی ئەو بیرۆکانەی کە لە مێشکیاندایە، گوتەیەکیش هەیە دەڵێت: ڕووناکی مۆمێك کەم نابێتەوە، بە داگیرسانی مۆمێکی دی، بەڵکو هەموویان بەیەکەوە ڕووناکی زیاتر دەبەخشنو ئەگەر جوانییەك، یان سەرکەوتنێکیش هەبێت، ئەوا هەموویان پێکەوە ئەو ناسناوە بەدەست دەهێنن.

هەر لەم سەردەمەداو لەم ئاڵۆزییەی ناخی مرۆڤەکانو ئەو چەندین دیوە جۆراوجۆرەی ڕوخسارو هەڵسوکەوتەکانی مرۆڤ، کە بەتەواوی دژ بەیەکن، دەبێت ژیانی خانمەکان چۆن بگوزەرێت؟! کە لە ڕاستیدا، دەبوو ئەوان وەك فریشتە ژیابانو هەموو خەیاڵە هەمەچەشنە ڕەنگاوڕەنگەکانیان بکرابایە ڕاستی، هەڵبەت کە میهرەبانییەکانی خانمان، هێندە بێئەندازەیە، تەنانەت ئامادەیە بەرهەمی ماندووبوونی هەموو تەمەنی بەش بکات لەگەڵ چواردەورەکەیدا، ئەو کات هەمووان سوودمەندو دڵخۆشو بەختەوەر دەبوون، بەڵام نەك هەر ئەمەیان بۆ ناکرێت، بەڵکو ڕێگەشیان پێ نادرێت، کە خۆیان ئەنجامی بدەن، لە هەر هەنگاوێکدا هەزارو یەك ڕێگر دەخرێتە بەردەمیان لە جێگەی هەزارویەك چانس! هەڵبەت ئەمە باسی ڕاستەقینەی خانمان دەکەین، کە لە بنچینەوە بەو شێوە درووستبوون، نەك ئەوانەی کە بە هەرهۆکارێك بێت خۆشیان بوونەتە دڕندەو بەردەبنە گیانی یەکترو سەرجەمی جوانییەکان دەکوژن لە پێناو بەدەرخستنی جوانییەکانی خۆیانو لە ئەنجامیشدا هەموویان لەناودەچن؛ چونکە یاسای ژیان بەم شێوەیە، کە لەدەرگای هەرکەسێك بدەیت بێگومان چاوەڕێی لێدانی دەرگاکەی خۆت بکە! لە ئێستادا وێنەی خانمان، وەك ئەو گوڵە وایە، کە هەمووان دەیانەوێت دەستیان پێی بگات، لە هەموو لایەکەوەو بە هەموو توانایەك لە هەوڵی ئەوەدان، چۆن گوڵەکان بشێوێنن، هەندێك بە ناوی ئازادییەوە، دەیەوێت دەستی پێی بگاتو بۆنی بکاتو دواتر لە لقەکەی خۆی جیای بکاتەوەو ماوەیەك بە دەستییەوە بێت، پاشان کە بۆنی نەما فڕێی دەداتە سەر زەویو گوڵیش بەهۆی متمانەکردنی زیاد لە پێویست، دەبێت بە قوربانی شوێن پێکانی گەڕیدەکان! هەندێکی دیکەش، بە ناوی پاراستنی گوڵەکەوە دەیخاتە ناو نیو پەرداخ ئاوەوەو لە ناو شووشەیەکی داخراودا دای دەنێتو پێی دەڵێت: فەرموو بژی!!! بۆیە باشترین ڕێگە، بۆئەوەی وەك سرووشتی خۆیان بمێننەوەو ژیانی ڕاستی بەدەست بهێنن، ئەوەیە ئەو دڕکانە لێ نەکەنەوە، کە بێگومان پەروەردگار بێ مەبەست درووستی نەکردووە، نیشاننەدانی میهرەبانی بۆ هەموو کەسو لە هەموو کاتێکدا مانای ئەوە نییە، تۆ کەسێکی خراپیت، بەڵکو مانای ئەوەیە کە تۆ پارێزگاری لە باشیو جوانی خۆت دەکەیت لە بەرامبەر ئەو کەسانەی کە شایستە نین، دەستیان بە تۆ بگات، هەروەك چۆن هەبوونی دڕکەکان، مانای ناشیرینی گوڵەکان ناگەیەنێتو ئەوە دەبێت بە پارێزگارێك بۆ ئەوان.

# هەندێ زانیاری لەبارەی پڕۆسەی پەروەردەو فێرکردن لە
# وڵاتی فنلەندا

- فێرکردن بێ بەرامبەرە.

یاسای وڵات - بانگکردنو ناوهێنانی مامۆستا بەبێ هیچ نازناوێك، دەبێت مامۆستا هەڵگری بڕوانامەی ماستەر بێت.

دابو نەریتی وڵات- خوێندکار جلو بەرگی دیاریکراو لەبەر ناکات، ڕێگە بە منداڵ دەدرێت پاپووچ، یاخود پێڵاوێك لەپێ بکات، کە لە پێی تێیدا ئاسوودە بێت.

یاساو دابو نەریتی وڵات- تاقیکردنەوەی هیچ خوێندکارێك ناکرێت، تا تەمەنی نەگاتە ١١ساڵی.

یاسای وڵات- فنلەندا تەنها تاقیکردنەوەیەکی نیشتیمانی هەیە، ئەویش تاقیکردنەوەی قۆناغی دواناوەندییە (قۆناغی وەرگرتن لە زانکۆ)، هەرچی تاقیکردنەوەکانی دیکەیە، تەنها بۆ هەڵسانگاندنی خوێندکارە، نەوەك بۆ دیاریکردنی ئایندەی.

یاسای وڵات- ڕۆژانە خواردنی تەندروست، بەبێ بەرامبەر دەدرێت بە خوێندکاران.

- مامۆستا خۆی سەرپشکە لە هەڵبژاردنی پڕۆگرام بەمەرجێك لەگەڵ یاسای وڵاتدا ناکۆك نەبێت.

یاسای وڵات- ماوەی خوێندن لە خوێندنگە ڕۆژانە لە شەش کاتژمێر زیاتر نییە.

دابو نەریت- هۆکاری گواستنەوە تەرخان دەکرێت بۆ ئەو خوێندکارانەی کە سێ کیلۆمەتر زیاتر دوورن لە خوێندنگە.



و: هەتوان کەریم

شەهێن حسێن



# بەبێ متمانە، هاوڕێیەتی بوونی نییە!

کاتێك دەمانەوێت قەڵەم هەڵبگرینو دەست بە نووسین بکەین لەسەر هەر بابەتێك، کە لە مێشکماندا جووڵاوە، هەزاران وشەو دەستەواژەو ڕستەگەلێك لە ناخماندا دێنو دەچن، کە ناتوانین بە تەنها بە ئامرازی پەیوەندی (ی) بەیەکیان بگەیەنین، هەروەك چۆن ڕووبارێك، یان چەمێك لە چەندین لاوە، جۆگەی ئاوی تێ بڕژێتە ناوو هەر جۆگە ئاوی لە دەشتو دۆڵێکەوە بەخێرایی تێپەڕ دەبێت، کە هیچیان لەگەڵ یەکدی تێکەڵ نابنو هەریەك خۆی وەك مرۆڤێکی لووتبەرزو سەرکەش نیشان دەدات، لە ئاست ئەوی دیکەداو سەرشۆڕ ناکەن بۆ یەکدیو ڕێگا نادەن تێکەڵی یەکدی ببن، بێئاگان لەوەی لە کۆتاییدا چارەنووسیان تێکرژانە، دوای ئەوەی هەریەك بە ڕێی خۆیدا دەڕوات، لە کۆتا خاڵ هەموویان یەك دەگرنو ڕووبار، یان دەریاچەکەی قووڵو هێمنیان لێ پێکدێت، لێرەدا دیمەنەکە لەوە دەچێت کە جۆگا ئاوەکان دەستەواژەو ڕستەکانی ناخماننو ڕووبارو دەریاچەکەش ئەو بابەتو نووسینەیە، کە لە کۆتاییدا دەینووسینو پێی دەگەین، وەك دیارو ئاشکراو بەڵگەنەویستە، کە مرۆڤ هەمیشە پێویستی بە هاودەمێك هەیە کە هاوشانی بێتو لە خۆشیو ناخۆشیدا وەك دیوارێك پاڵپشتی بێت، ئەم دیوارو پاڵپشتەش دەکرێت، ناوی لێ بنێین هاوڕێ، دەکرێت وا بیناسێنین کە درووستکراوێکی پەروەردگارە کە هەریەکەمان بە ویستی خۆمان هەڵی دەبژێرین، بەبێ ڕەچاوکردنی جیاوازیی ڕەچەڵەكو زمانو ڕەنگو بیرورا، هەرچەندە زۆر جار وا ڕێ دەکەوێت، کە کەسێکی نەناسراوو غەریبەیە، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات دەبێت بە کەسێکی نزیك لێمان، جێگەی خۆی لە دڵماندا مسۆگەر دەکات.

مەبەستمانە ئەوە ڕوون بکەینەوە، کە ئەم هاوڕێیەتی، بەبێ بوونی سیفەتێك مانای تەواوی هاوڕێبوون نادات بە دەستەوە، ئەو وشەیە، یان سیفەتەش بریتییە لە: بوونی متمانە لە نێوان هاوڕێکاندا، کە بە نەبوونی بەردی بناغەی هاوڕێیەتی بەرەو شەقبردنو لەناوچوون دەبات، دەکرێت ئەوە بهێنینە بەرباس کە خەڵکی هەرگیز لۆمە ناکرێن لەسەر ئەوەی کە ڕژدو چرووك بن لە بەخشینی متمانە؛ چونکە کاتێك بەخشرا، مانای وایە ئیدی جڵەوی خۆت دایە دەستیو خۆت دەخەیتە ژێر بەزەییو ویژدانی هاوڕێکەتو دەبیت بە دیلی دەستی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەبێت ئەوە لەبەرچاو بگرین، کە کەسی بەخشەر بە بەخشینی متمانە هەژار ناکەوێت، بەڵکو یاسا وایە کە بەرامبەرێکی دەست بکەوێت، کە ئەو بەرامبەرەش هێندە زۆرە شایەنی ئەوەیە متمانەکەی لە پێناودا ببەخشێت، لێرەدا بەخشەری متمانە دڵنیاییو ئارامیی دەروونیو هۆگریو حەوانەوەی ناخو دەروون وەردەگرێتو هەست بە بەتاڵکردنەوەی ناخی گرگرتووی دەکاتو گوێڕایەڵو گوێگرێکی دەست دەکەوێت، کە بەبێخەمی نهێنییەکانی دەروونی بۆ دەکاتەوەو دەردی دڵی لا باسو تاوتوێ دەکات، بەمەش ناخی ئارام دەکاتەوەو کوڵی دەروونی بارسووك دەکات.

هەمیشە وا بووەو هەرواش دەبێت کە ئەوەی ئەم مامەڵەیەمان لەگەڵدا دەکات، بێگومان هاوڕێیە.. گوتەیەك هەیە کە دەڵێت: (متمانەبەخشین بە کەسێك پێش تاقیکردنەوە گەمژەییە)، واتە: گەر بمانەوێت کەسێکی ژیرو وریا بینو نەبین بە قوربانی هەڵەی هاوڕێگرتنو خۆمان تووشی دەردەسەریو سەرئێشە نەکەین، ئەوا پێویستە پێش ئەوەی متمانە ببەخشین بە کەسێك، تاقی بکەینەوە؛ تاوەکو بزانین تا چ ڕادەیەك شیاوی متمانەپێدانە، ئایا گرەنتی ئەوەی هەیە، کە لە داهاتوودا خیانەتمان لێ ناکاتو ناپاکی نانوێنێت بەرامبەرمان، لە پاشاندا بڕیار لە بارەیەوە بدەین.. لە کۆتاییدا پێویستە ئەوە بگوترێت: گەر لە هەر شتێکدا دەستبڵاوو بەخشندەیت، ئەوا لە پێدانی بەخشینی متمانەدا، ئەوپەڕی ڕەزیلیو دەستگیرۆیی بنوێنە؛ چونکە متمانە، زێڕێکی گرانبەهایە بە کەسێکی ببەخشە، کە ڕەفتارو ناخی زێڕئاسا بێت.

# پەروەردەی منداڵ

گوڵان حەمەئەمین

ئازیزانو خۆشەویستانی خوێنەری بڕیار، وا سێ ساڵە لە خزمەتتاندام لە گۆشەی منداڵی تەندرووست، زیاتر لە ٣٦ ژمارەدا، باسمان لە سەرەتای پەروەردەکردن کە لە ژینگەی سکی دایکەوە دەست پێدەکات، تا لەدایکبوونو کاتی شیرەخۆریو پێگرتنو هاتنەگۆو یاریکردنو چونە باخچەو قوتابخانە، تا تەمەنی مێردمنداڵی، باسمان لە گەشەی منداڵو خۆراكو لایەنی دەروونیو کۆمەڵایەتیو لایەنی ڕۆحیو ئارەزوی منداڵو تایبەتمەندییەکانی منداڵ بەپێی تەمەنەکانی کرد، باسمان لە گرنگیی پەروەردەو سازانی دایكو باوك لەسەر شێوازی پەروەردەو گرنگیی چیرۆكو گرنگیی خۆشەویستیو پێویستیی منداڵ بە خۆشەویستیو متمانەبەخۆبوون کرد، هەروەها شەڕەنگێزیو درۆکردنی منداڵ، خۆتەڕکردنی شەوانە، ترسی چوونە قوتابخانەو چۆنێتیی ئامادەکردنی بۆ چوونە قوتابخانە، کاریگەری تەلەفزیۆنو بەکارهێنانی ئینتەرنێتو ڕۆشنبیرکردنی منداڵ، چەندین بابەتی دی، کە بەسوودوەرگرتن لە ماڵپەڕەکانو سەرچاوە ناوازەو دەگمەنەکانی پسپۆڕانی بواری پەروەردە، هەوڵمان داوە، کۆمەڵێك زانیاری پێشکەش بە ئێوەی خۆشەویست بکەین. دەخوازم ئەم گۆشەیە سوودی گەیاندبێت بە ئێوەی ئازیز بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانتان، کە بناغەیەکی زۆر گرنگی کۆمەڵگایە. خوێنەرانی ئازیز لە کۆتایی ئەم گۆشەیەدا، ئەو وتەیەی پێشینان دەکەمە دیاری بۆ ئێوەی بەڕێز کە دەڵێت: (لاعِبْهُ سَبعاً ثُمَّ عَلِّمهُ سَبعاً ثُمَّ صاحِبه سَبعاً)، تەنها ئەم وتەیەمان بەسە ئەگەر جێبەجێی بکەین، دەبینی منداڵ لە لەدایکبوونەوە تاحەوت ساڵ، پێویستی بەیاریکردنە، تەواوی شتەکان لەم تەمەنەدا کە فێری دەکەیت، پێویستە بەیاریکردن بێت؛ چونکە منداڵ حەزێکی تەواوی بۆ یاریکردن هەیە، زۆر کات زیاتر لەوەی لەگەڵ هاوتەمەنەکانی پێی خۆشە لەگەڵ گەورەکان یاری بکات، کاتێك گەورەکان خۆیان دەبەنە ئاستی حەزی یاری منداڵەکان دەبینی منداڵ زۆر دڵخۆش دەبێت بەو کارە، سەرەنجام ئەو کەسەی زۆر خۆش دەوێت کە یاری لەگەڵدا دەکات، ئەی ئەگەر هاتوو بەدرێژایی حەوت ساڵ تۆ یاریت لەگەڵدا کردبێت، چ پەیوەندییەکی تۆکمەو خۆشەویستی درووستبووە لە دڵیدا!!! پاشان فێری بکە کە لەحەوت ساڵی دووەمدا، واتە لە حەوت ساڵی تاچواردە ساڵی تەمەنێکی زۆر گونجاوە بۆ فێربوون، هەروەها بەدرووستبوونی پەیوەندییەکی پتەوی پێش حەوت ساڵی زۆر بەئاسانی ئەوەی فێری دەکەیت لێت وەردەگرێت، پاشان لە حەوت ساڵی سێیەم واتە: لە چواردە ساڵی تا بیستو یەك ساڵی هاوڕێیەتی بکە، وەك ئاشکرایە لای هەموان لە تەمەنی چواردەساڵی بۆ سەرەوە هەرزەکار زۆری پێناخۆشە، هەندێ کات بە ڕووی گەورەکاندا هەڵ ئەشاخێتەوە، کاتێك شتێکی پێدەڵێیت، بۆیە باشترین ڕێگای مامەڵەکردن لەم تەمەنەدا بریتییە لە هاوڕێیەتیکردنی، هاوڕێیەتیکردنیش ئاشکرایە چۆنە حەزی لەوەرزشە، یان مەلەکردن، یان هەر شتێکی بەسوود وەك هاوڕێییەك تا دەتوانیت بچۆ لەگەڵی بەشداری حەزەکانی بکە، لێی نزیك بەرەوە تاببیتە ئەو هاوڕێیەی جێی ڕازو نیازی ئەوبێت، ببیتە ئەو هاوڕێیەی کە لەسەر ڕێبازو ڕێچکەی تۆ مامەڵە بکات.

لێرەشەوە دەگوێزینەوە بۆ لای گۆشەیەکی دی کە چینی هەرزەکار لەخۆ دەگرێت، ئەویش دەبێتە دوو بەش، کوڕانو کچان کە هەریەکەیان لەم تەمەنە بەدواوە تایبەتمەندی خۆیان هەیەو لایەنی دەرونیو بیرکردنەوەیان بە جۆرێکە، هەروەك چۆن پێداویستیو چۆنێتیی مامەڵەکردنیش لەگەڵ هەر یەکێکیان تایبەتمەندی خۆی هەیە، بە باشمان زانی لەخزمەتتاندابم بۆ گۆشەیەکی نوێ تایبەت بە کێشەکانی کچان، هەروەها چۆن مامەڵە لەگەڵ کچانی تازە پێگەیشتودا بکەین، بەسوودوەرگرتن لە ئەزموونی کەسانی پسپۆڕو سەرچاوەی تایبەت...
چاوەڕوانمان بن لە گۆشەیەکی نوێدا بەخزمەتتان دەگەین!



لەسەر شۆستەی ژێر بەرزە پردەکە دانیشتبوو، گونیەیەکی لەبەردەم بوو چەپکە نێرگزەکانی لەناودا ڕیزکردبوو، ناوە ناوە ڕشێنە ئاوێکی بەسەردا دەکردن؛ بۆئەوەی ماوەیەکی زیاتر بەگەشی بمێننەوە. دوو منداڵی دیکەش لەو ناوە گوڵی ڕەنگاوڕەنگیان دەفرۆشت. هەرچەندە گوڵەکانی ئەوان سرووشتی نەبوون، بەڵام کڕیاریان زۆر زیاتر بوو. ئەوا ئەمڕۆش خەریکە ڕۆژ ئاوا دەبێت، بەڵام ئازاد تەنها چەپکێك نێرگزی فرۆشتووە.

ئازاد دوو ساڵ لەمەوبەر بەهۆی نەخۆشیی دایکییەوە، وازی لە قوتابخانە هێنابوو، بەڵام زۆر حەزی لە خوێندن دەکرد. بۆیە هەمیشە دەفتەرێکی لەلابوو ڕۆژانە یادگارییەکانی تیادا دەنووسییەوە.

ئۆتۆمبێلێك لایدایە نزیك شۆستەکە، پیاوێکی چاویلکە ڕەش جامەکەی هێنایە خوارەوەو گوتی:

-چەپکێك نێرگزم بدەرێ.

*فەرموو قوربان.

- نێرگزەکانت خەریکە سیس دەبن، نامەوێت، گوڵی دەستکردت لانییە؟

* نەخێر قوربان، بەڵام ئەوانە باشترن، گوڵی دەستکرد بۆنی نییە.

- جوانییەکەی لەبۆنەکە گرنگترە. ئەوانەم بۆچییە؟

ئۆتۆمبێلەکە ئازادی جێهێشتو ئەویش بەنامرادی بەرەو لای یادگارییەکانی گەڕایەوە.

ئازاد ڕۆژانی هەینی لەگەڵ دایکی سەردانی گۆڕی باوکی دەکرد. دایکی ئازاد گوڵە نێرگزی لەسەر گۆڕەکە چاندبوو، لەبەهاراندا، بەچەشنی مێرگێکی بەهەشت، سەمای نێرگزەکان لەژێر شنەبای بەهاردا، هیوایەکی تازەیان بە ئازادو دایکی دەبەخشی. هەرچەندە دایکی ئازاد ئافرەتێکی خۆڕاگربوو، بەڵام هەمیشە دەیووت: تەنیایی هەر بۆ خودا باشە. مردنی باوکت کەلێنێکی گەورەی لە ژیانی ئێمەدا جێهێشت. هەمیشە ئێمەی مرۆڤ کاتێك بە یەکەوەین، هەست بە خۆشی بەیەکەوەبوون ناکەین. چێژ لە یەکتر وەرناگرین. لە دوای دابڕان، ئینجا هەست بەو کەلێنە گەورەیە دەکەین. ئینجا دەزانین ئێمە چەندە دڵڕەقین. چەندە نەزانو نابینایین. کە جوانییەکان لەدەست دەدەین، ئینجا هەست دەکەین چەندە بەختەوەر بووین. ئەو کاتەش پەشیمانی داد نادات. ئیتر ئەوە ژیانە، ڕۆڵە شیرینەکەم، هەوڵ بدە چێژ لەو ژیانە وەربگرە بەرلەوەی لەدەستی بدەیت.

ئازاد لەگەڵ دەنگی هۆڕنی ئۆتۆمبێلێك وریا بووەوە. تیشکی خۆر تینی خۆی لەدەستدابوو. تەنیا خەپلەیەکی سوور بەئاسمانەوە مابوو. چەند پەڵە هەورێك دەوریاندابوو. ئای کە دیمەنێکی جوانە. چەند پەڵەهەورێکی ڕەنگ زەرد، وەك ئەوەی خەریکی بەڕێکردنی خۆربن بۆ سەفەرێکی دوور، یان لەوانەیە



# نێرگزفرۆش

ئیبراهیم بەهادین خەتەیی

لەدەوری خۆر کۆبوونەتەوە؛ بۆئەوەی لەو سەفەرە پاشگەزی بکەنەوە. هەرچۆنێك بێت، هەمیشە لە دیمەنی خۆرئاوابووندا، خەپلەی خۆرو ئەو پەڵەهەورانە بەیەکەوە جوانن، ئەو دیمەنە بەچەشنی ئیقاعی پارچە مۆسیقای ژیان، کاتێك دووبارە دەبێتەوە، جوانییەکانی ژیانمان نیشان ئەدات.

لەگەڵ دەنگی هۆرنی ئۆتۆمبێلێکی دیکە ئازاد سەری بەرزکردەوە، ئۆتۆمبێلێکی سپی لەوبەری شەقامەکەدا وەستابوو، شوفێرەکە بانگی کرد: ڕۆڵە چەپکێك نێرگزم بۆ بێنە.

ئازاد لە خۆشیانا وەك ئەوەی باڵی گرتبێت چەپکێك نێرگزی بەدەستەوەگرتو بەخێرایی بەرەو شەقامەکە ڕۆیشت، لەو کاتەدا ئۆتۆمبێلێکی زۆر خێرا خۆی بە ئازادا کێشاو جەستە لاوازەکەی کەوتە ئەوبەری شەقامەکە. خێرا ئازادیان لە ئۆتۆمبێلە سپییەکەدا گەیاندە نەخۆشخانە. جەستە لاوازو بێ هێزەکەی وەك لاشەیەکی بێ گیان لەسەر تەختەیەك دانرابوو. سەعاتێکی کۆنو شکاو بە مەچەکە لاوازەکەیەوە بەسترابوو، لەسەر کاتژمێر پێنجو پێنج خولەك وەستابوو. ئەو مناڵە هیچ ناسنامەیەکی لانەبوو، بەڵام دەفتەری یادگارییەکانی لەباوەشی خۆی گرتبوو. دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوت لەدەفتەرەکەدا بە هیچ شێوەیەك ئاماژە بۆ ناونیشانو شوێنێك نەکراوە؛ بۆئەوەی هەواڵ بە خانەوادەکەی بدرێت. هەرچەندە دەفتەرەکە زۆر تێکچووبوو، بەهۆی داڕووشانو پەڵە خوێنەکان بەشێکی نووسینەکە دیارنەمابوو، بەڵام لەدوالاپەڕەکەیدا نووسرابوو:

ئێستا سەعات چوارو نیوی ئێوارەیە، دەڵێن بەیانی جەژنی قوربانە. ئەگەر چەپکێك نێرگزی دیکە بفرۆشم دەتوانم دەرمانەکە بۆ دایکم بکڕم. ئەمڕۆ هەرچەندە برسیم بوو، بەڵام خواردنی نیوەڕۆم پێچاوەتەوە؛ بۆئەوەی ئێوارە لەگەڵ دایکم بەیەکەوە بیخۆین. هیوادارم ئەو دەرمانەم دەسکەوێت؛ بۆئەوەی بەیانی لەگەڵ دایکم بەیەکەوە بچین بۆ سەر گۆڕی باوکم. ئاخ باوکەگیان بۆ جێتهێشتین.. بەیانی بەباوکم دەڵێم: دەزانی بابەگیان ئێستا شارەکەمان زۆر لەجاران جوانترە؟ باڵەخانەکان لە قەڵات بەرزترن! شۆستەکان پڕن لە گوڵو چیمەن! بەڵام خەڵکەکەی زۆر جیاوازن، ئێستا خەڵکی گوڵی سرووشتی ناکڕن. هەموویان گوڵی دەستکردی بیانی بۆ یەکتر دەکەن بە دیاری. ئەمڕۆ بە پیاوە چاویلکە ڕەشەکەم گوت: گوڵی سرووشتی باشترەو بۆنی خۆشە، بەڵام باوەڕی بە من نەکردو گوتی: (جوانییەکەی لە بۆنەکە گرنگترە، ئەوانەم بۆ چییە)، بەڵام بابەگیان من باوەڕم پێی نەکرد، من هەمیشە نێرگز دەفرۆشم، تۆش خەمی دایەت نەبێت، من دەرمانەکانی بۆ دەکڕم...

لەدەفتەرەکەدا زۆر شتی دی نووسرابوو، خۆشیو خەمەکان.. ڕابوردوو داهاتوو، ئاواتو خەونەکانی منداڵێك کەلەگەڵ خۆرئاوابوون گیانی لەدەستدا، ئەگەر دەرفەت بوو لە داهاتوودا ناوەڕۆکی دەفتەرەکەی ئازاد بڵاو دەکەینەوە، ئاسەواری منداڵێکی بێنازی ئەم شارە، بەڵکو بەرپرسانی شارەکەم کەسێکیان تیابێت، تا ئەو ئاستە خوێندەوار بێت، ئەو دەفتەرە بخوێنێتەوەو لێی تێبگات.

# مانای خۆشەویستی

هەموو بەیانیەك، نەنە لەگەڵ ڕۆیشتنی بۆ فرۆشگا؛ بۆ کڕینی نانو پەنیر بۆ خوانی بەیانی، لەوێ لە فرۆشگا هەندێ نەستەلە بەتامی دەکڕی بۆ نەوە خۆشەویستەکانی. کە کچێکی ٧ ساڵانو کوڕێکی ٥ ساڵان بوو.. نەستەلەیەك بۆ کچەکەو نەستەلەیەکیش بۆ کوڕەکە.. کچەکە هەموو ڕۆژێك نەستەلەکەی دەخستە ناو گیرفانی چاکەتەکەی.. ڕۆژێ براکە لە خوشکە گەورەکەی پرسی، دادەگیان خۆشەویستی چییە؟ خوشکەکەشی ماچێکی ڕوومەتە ناسکەکانی کردو گوتی: خۆشەویستی ئەوەیە: هەموو ڕۆژێك نەستەلەی ناو چاکەتەکەم دەبەیت، منیش هەموو ڕۆژێك لەبەر تۆ، نەستەلەکەم دادەنێمەوە!

سوڵتان دیار



کێ ئێستا، هاواری دڵمت بۆ بێنێ؟!

پەیامـی ڕۆحو بارانی ئەسـرینو ئاهـی دەروونمت بێنێتە حزوور!؟

چۆن پێت بڵێم، بیرت دەکەم؟!

دەنگی من، چۆن دەگاتە دیوانی تۆ؟

چـۆن بزانی ئێستا لـە دووریـت، چی مەراسـیمی حوزنو ماتەمێکم ئامادەکردووە؟

ئێستا من، چۆن بزانم کە دەژیم، یان نا؟

چۆن بتوانم سـەر بخەمە سەر دڵت؛ تا گوێم لە ترپەی دڵت بێ؛ بۆئەوەی دڵنیا بم، کە هێشتا زیندووم!!

چۆن بزانی، ئێسـتا بست بە بستی ئەم وڵاتەت بۆ دەگەڕێم، نێو لاپەڕەی شـیعرەکانم، نێو شووشـەی گوڵاوەکانم، نێو کتێبو کتێبخانەو جلوبەرگو نێو کاغەزو نێو قەڵەمو نێو چاوانم؟!

ئـای ئازیزم، چەند سـەختە، لەنێو چاوما بـۆت دەگەڕێم!! لەنێو گلێنەکانما، بۆ نیگایەکت وێڵم!

چـۆن بزانی ئێسـتا گـری دووریت، چـۆن وەك ئاگرێك، لە پەرێزێك بەربووبێت..

وەك بڵێسەیەك، دەستی نابێتە گەرووی خەرمانێك!

وەك گرەیـەك، ڕەوە خونچەیـەك بخنکێنـێ، ئـاوا تاسـەی دیدارت، دڵو هەناوم دەتوێنێتەوەو دەیکاتە خۆڵەمێشی سپی!

وەك سـپێنەی ئەو چاوانەی کە خەریکن، لە تاسەی دووریی تۆدا، تاریك دەبن!

# پەیامی ڕۆح



کێ پێت بڵێ، ئێستا چۆن چاوەڕوانتم، کێ پێت بڵێ، ئێستا چەندە بیرت دەکەم!

پەیامی من، بە گوێی ئەم دڵبەرە نازدارە ڕاناگا
نەسیم "بێسیم" دەبینێ، شل دەبێ، بەم کارە ڕاناگا
گوتی سەبرت هەبێ، دووبارە دێمە دیتنت ئەمما
لە کورتیدا تەمەن وا دیارە، بەو دیدارە ڕاناگا -هێمن-

توخوا ئەگەر ئەمجارە هاتی، ئیدی جێم مەهێڵە!

لە دەیان ساڵی چاوەڕوانی، گەردنت ئازاد بێ، لە عومرێك کە بەخشیم بە هاتنت، گەردنت ئازاد بێ، لە هەزاران شەوی تەنیاییو گیانو بێکەسیم، گەردنت ئازاد بێ!

بەڵام ئیدی ئەگەر بەجێم بهێڵی، گەردنت ئازاد ناکەم!

ئاخر نابێ قسەکانم بکەم، نابێ ڕازی عومری خۆمت بۆ بەیان بکەم!

من پێش ئەوەی بگەم بە تۆ، هەزارو یەك ئاواتو خەونو خۆزگەم هەبوو، بەڵام لەو ڕۆژەوە، بە تۆ ئاشنا بووم، ئیدی جگە لە گەیشتن بە تۆ، هیچ ئاواتێکی دیم نییە!

من لە دەرگای ئەوینی تۆوە، هاتمە نێو دنیای عیشق..

خودا بە تۆ، منی بە خۆم ئاشنا کرد.........،

تۆی نارد؛ تا ڕزگارم بکەی!

تۆ، نێرروای خودای بۆ من!

ڕێگام پێ بدە؛ بێمە بەر دەرگاکەت، من بە غوڵامی بەردەرگاکەت ڕازیم، هیچی دیم ناوێ!

ئیدی بۆ من، هیچ شتێك گرنگ نییە، جگە لەو ڕۆحەی کە سەرچاوەی ڕۆحی منە!

ئیدی من گوێی دڵم، جگە لە ئاوازی دەنگی تۆ، هیچی دی ناژنەفێ!

ئیدی سنگم، جگە لە بۆنی هەناسەت، گوڵاوی هیچ جەننەتێك هەڵنامژێ!

ئیدی چاوەکانم ئاسۆیەك نابینن؛ بۆی بڕوانن، جگە لە ئاسمانی ڕوخسارت!

ئیدی جگە لە موتاڵای کتێبی پەرچەمت، تەمەنم بەشی هیچی دی ناکا!

مردەو نەمزانی، ئەو ئاورەی، منی سووتاند چ بوو
حاسڵی سەیروسلووکی عاشقان، هەر حیرەتە -وەفایی-

بەڵام ئەوەندە دەزانم، کە ئیدی ژینو مردن، بەتۆوە پەیوەستە!

هەموو ئەسراری وجوودم، لە نێو دەستی تۆدایە!

سروەی سەعادەت، لە دەڤەری تۆوە هەڵدەکاو پرووشەی بارانی حەیات، لە خەندەی تۆوە، دەبارێتە نێو باخچەی عومرم!

ڕۆحم، جگە لە سەفەر بۆ لای تۆ، هیچ ڕێگایەکی دی نازانێ!

شەوانە، بە ئاوازێك، دەردی دووریو ساتە سەختەکانی تەنیایی دەردەبڕەو بە نەوایەك دەگریم، تا ئێستا کەس ئەو ئاوازەی نەبیستبێ!!

مردەو هەرگیز نەگەیمە قیبلەی تاقی بڕۆت
ئاخر ئەی قیبلەی مورادان، تا بەکەی، ئەم حەسرەتە -وەفایی-

خۆزگە دەمتوانی کاتژمێرەکان ڕاگرم، دڵم لە لێدان بوەستێو هەناسە نەدەم، کانیاوەکان هەموو وشك بن!

تا تۆ دێیت، تا تۆ دەگەڕێیتەوە!

ئیدی ناتوانم ئۆقرە بگرم!

ئیدی بڕستی سەبرم نەما، چیدی ناتوانم ئەم ئەوینە بشارمەوە!

چەندی من، ڕازی دەروونی خۆم، لە خەڵکی شاردەوە
ئاخری لێم ئاشکرابوو، ڕەنگی زەردم خۆی نواند -هێدی-

خۆ ئەگەر بێزاری لە ناڵەو گریانی منو چاوت بە وێرانەی دڵی تەنگو خەمبارم هەڵنایە، لەو وێرانەیە گەڕێو سەرێك لە دەریای فرمێسكو مەوجی ئەسرینم بدە!

ئەگەر ڕەنجیدە بووی قوربان، لە وێرانەی دڵی تەنگم
وەرە سەر مەنزەرەی چاوم، تەماشای مەوجی دەریاکە -وەفایی-

بەڵام ئەگەر تۆ بێیتو سەرێك لە کۆنەهەواری دڵ بدەیتەوە، گوڵخەن دەکەی بە گوڵشەنو شین دەکەی بە شاییو حوزن بە شادیو وێرانەی دڵ دەکەی بە دیوانی بەهەشت، ئەی شازادەکەی مەملەکەتی عیشقو ئەوینم!

وەرە، هەرچی خەم هەیە، وەلاینێ، هەرچی دەردی دووریو تەنیاییە، فەرامۆشی کەین!

وەرە بە دەستی خۆت، فرمێسکەکانم بسڕەو تۆزی غوربەتم لە سیما بڕەوێنەوە!

وەرەو ئیدی هەرگیز جێم مەهێڵەو لە بۆنی هەناسەت، مەحروومم مەکە!

وەرەو با ژیان بەردەوام بێ، با گوێم لە ترپەی دڵت بێ، تا دڵنیا بم، هێشتا دەژیم.. با دڵنیا بم لەدایك بوومەوە!

پەلەت بێ، چاوەڕێتم، زوو وەرە، بەس خۆت بخافڵێنە
هەزار جار هێمنیش بم، بۆ ویساڵت، چۆن پەلەم نابێ -هێمن-

گەرمیانی



# نامە نوورییەکان

## نامەی چل و سێ

دواساتەکانی کۆتا شەوی ڕەمەزانی پیرۆزە، هەست بە خەمێکی قووڵ دەکەم.. مامۆستا هیچ شەوێك ئاوا، هەستم بە تەنیاییو نیگەرانی نەکردووە!!

تۆ دەزانی، ڕەمەزان بۆ من، دونیایەك یادگاریو ئەلبوومێك یادەوەریی خۆشو بێوێنەیە!

هەست دەکەم ئەمشەو، میوانێکی ئازیز جێم دەهێڵێو ماڵاواییم لێ دەکات!

بە دوی خۆیدا، کۆمەڵێ وشە جێ دێڵێ، کە بۆ منی زێدە هەستیار، زۆر ئەستەمە!

ماڵاوایی، دوعاخوازی، تەنیایی، چۆڵبوونی هەوارو ئاوابوونی، گوڵو عەبیری خۆشەویستێك!

چی دەبوو، ئەگەر جێت نەهێشتبام!

ئیدی من شەوانە، لە چ میحرابێکا نزا بکەم؟

کێ لە سەحەرا بە ئاوازێ نەرمتر لە ئاوریشم، بانگم بکاتە سەر خوانی پارشێوی ئەوینی خودایی؟

ئێواران کێ لەگەڵ دەنکێ خورمادا، شیرینی ببەخشێ بە ڕۆحمو خۆشیو فەرحەی ئیلاهی بکاتە خەڵاتی دڵم؟

شەوانە لە دەرگای چی ماڵێ بدەم؟ ئیدی دیوەخانی دڵم دادەخرێو چرای ژوانی شەو دەکوژێتەوە!

چەند جیهانێکی ئەفسووناوی بوو مامۆستا، منو قورئانو بەرماڵەکەم!

هاوڕێی هەمیشەیش، ئەسرینی چاوی خەجاڵەتم!

بێ ئەو شەوە نوورینانە چی بکەم؟!

ئازیزم، ئێمە نابێ تەنها کاتی ماڵاوایی بۆ ئازیزانمان بگرینو هەست بە چۆڵیی شوێنەکەیان بکەین!

دەبێ هەمیشە لەنێو دڵمان بژینو لێمان جودا نەبنەوە، هەمیشە میوانی ڕۆحمانبنو هاودەمی ساتەکانی ژیانمانبن.

ماڵاوایی لە وەرزی گوڵاوپرژێنی دڵەکانو ژوانی ڕۆح سەختە!

لەیادکردنی ئەو ساتانە ئەستەمە، کە دڵ دەگاتە دامێنی عەرشو چاو لەگەڵ ئەستێرەکانا، بۆ ڤیستیڤاڵی ڕۆح، بە فرمێسکی پەشیمانی، پەیامی فریشتەیی تۆمار دەکات!

لەیادکردنی ئەو ساتانە سەختن، کە بەندە لە بەیانەوە، تا ئێوارێ، چاوەڕوانی ئێزنی مەحبووبە؛ بۆ قومێك ئاوی سارد!

شەوانی قەدرو ئەسراری بەدرو بەیداخی نەسر، لە دیدەی خەیاڵ ناچنە دەر!

ناڵەی نیوەشەوو ئیستیغفاری ئەسحارو خوانی سەحوری مەولای دڵ، چۆن لەیاد دەکرێ؟!

بەڵام نابێ، هەر لەگەڵ یادگارییەکاندا بژینو ژیان فەرامۆش بکەین.

با هەموو ساتەکانی ژیانمان، بکەینە یادەوەری خۆشو بە مەرەکەبی نوور، لە پەڕاوی تەمەنماندا، جوانترین کردارو گوفتار تۆمار بکەین!

با هەمیشە خاوەنی دڵە پاکو بێگەردەکەی ڕەمەزان بین!

با هەمیشە، خاوەنی سۆزو میهرو بەزەییەکەی ڕەمەزان بین!

ئەو چاوانەی کە بە تارای شەرمو شکۆ لە خوداوەند دامانپۆشیبوو، ئیدی جارێکی دی، بۆ شتێك پێی نەڕوانین، کە خودا پێی خۆش نییە!

با ئەو لێوانەی کە بەردەوام، خەریکی زیکرو یادی خودابوون، لە ئاوازی خۆیان نەسرەون!

با ئەو هەنگاوانەی بەرەو ماڵەکانی خودا دەڕۆیشتن، وچان نەدەن!

لە ڕەمەزاندا، دڵمان لە پەڕەی گوڵ ناسکتربوو، با ڕێگە نەدەین، تاوان بیکاتەوە بە بەرد!

لە هەموو ڕقو کینەیەك پاکمان کردبوونەوە، با ئیدی جارێکی دی، نەیکەینەوە بە هێلانەی ئەهریمەن!

لە ڕەمەزاندا، ئازاری کەسمان نەدەدا، غەیبەتی کەسمان نەدەکرد، گۆشتی کەسمان نەدەخوارد؛ بۆئەوەی ڕەنج بەخەسار نەبین!

ئیمامی شافیعی دەفەرموێ: (بِئْسَ الزَّادُ إِلَى الْمَعَادِ الْعُدْوَانُ عَلَى الْعِبَادِ.)

خراپترین توێشوو بۆ قیامەت، ستەمو دوژمنکاریی بەندەکانە!

هەروەها دەفەرموێ: (مَنْ أَرَادَ أَنْ يَقْضِيَ اللّهُ لَهُ بِالْخَيْرِ فَلْيُحْسِنْ الظَّنَّ بِالنَّاسِ).

واتە: ئەوەی دەیەوێ، خودا بە چاکە، مامەڵەی لەگەڵدا بکات، با گومانی باش بە خەڵکی ببات.

خۆ ئەوەی ئێمە لەبارەی خۆمانەوە دەیزانین، لەبارەی کەسەوە نایزانین، کەواتە: بۆچی گومانی باش، بە خەڵکی نەبەین؟!

کابرایەك لای مەعرووفی کەرخی دانیشتبوو، غەیبەتی کابرایەکی کرد.

پێی گوت: فڵان، بیری ئەو ڕۆژەت هەبێ، کە لۆکە لەسەر چاوت دادەنرێو بەتەنیا دەخرێیتە گۆڕ!

لە ڕەمەزاندا، مردنمان باش لە یادەو زۆر بە چاوێکی کەم، تەماشای دونیا دەکەین!

خۆمان بۆ سەفەری یەکجاری ئامادە دەکەینو خۆمان لە دونیاویستی دەپارێزین!

پشتمان لە دونیاو ڕوومان لە ئاخیرەتە!

لەوێدا، خۆمان بە دەوڵەمەندترین کەسی دونیا دەزانین، کۆڵی قورسی دونیا دادەنێینو دڵمان پڕ دەبێ لە شادی!

غەرقی دەریای نوورو شنەی فەیزی ئیلاهی دەبین، دیوەخانی دڵمان، وەك چراخانی شەوانی تەراویح ڕووناکە!

نیگامان شەرمن، سیما پەشێوو پەشیمان!

ساتەکانی تەمەن بە هادار!

هەموو چرکەیەکی، کانێکە لە ئاڵتوون..

یادە، تیلاوەیە، ئیستیغفارە، فەرمانە بە چاکە، دەستووره بۆ قەدەغەکردنی خراپە!

هێمنی سەکینە، ویقار، ئارامی، ئۆخژنی دڵ، سەعادەتی بێسنوور!

با ئەم هیممەتە، بەردەوام بێ ئازیزم، ئەم پەیمانەی لەگەڵ خوداوەندا بەستمان، نەیشکێنین!

ئێمە، گەردنمان دایە دەست خوداوەند؛ تا لە دۆزەخی ئازاد بکات.. ئێمە، لە ڕیزی «عتقاء»دا، خۆمان ناونووس کرد!

ئێمە چاوەڕێی کلیلی «ڕەییان» بووین..

ماڵاواییمان کرد لە ڕەمەزان، بەڵام ماڵاوایی لە تەوبەو ڕیزوانی ئیلاهیو چرای ئیمانو تارای تەقواو قەڵغانی عەفافو بەیداخی بەندایەتی ناکەین!

لە ڕەمەزاندا دەژین.. نەك تا ڕەمەزانێکی دی..

بەڵکو تا «فەرحەی دووەم»، تا لیقای ئیلاهی.

ع. ش. شێرکۆ

# لەگەڵ «ناسری حیسامی» شاعیردا



شاعیر، لەساڵی ١٩٥٩، لە گوندی شێخاڵی، لە ناوچەی موکریان لەدایك بووە.

شاعیر، ئەدیبو نووسەرو وەرگێڕێکی هاوچەرخەو خاوەنی چەندین شیعری جوانو لێکۆڵینەوەو ڕەخنەی ئەدەبییەو ئێستا لە ژیاندایەو نیشتەجێی وڵاتی سویدە.

ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی:

## خامۆشی

شنەی یادت لە بێشەمەدایە ئەمشەو
بەنەرمی هەڵدەکا ئەو بایە ئەمشەو
لە دیدەم، ئەشکی ڕوون ڕێگا دەپرسێ
سەفەر گۆیا بەرەو دەریایە ئەمشەو
دەڵێی فەرهاد چووەتە خەونی شیرین
لە کێوی بێستوون، دەنگ نایە ئەمشەو
بە شادیت، هەر گڕی مۆم بوو سەمای بوو
لە ژووری بێچرا، سەرمایە ئەمشەو
کە تۆ بووی، مانگ لە نێو گۆمدا مەلەی کرد
لە پشت هەورە، لە ڕووی هەڵنایە ئەمشەو
وەرە، وەزمانی بێنەو بیدوێنە
کە پەنجەی تۆی دەوێ، ئەو نایە ئەمشەو
لە ناخیدا هەزار گۆرانی مەیوە
لە بێتۆیی، پشووی دەرنایە ئەمشەو
بە خاكو خۆڵ دەخافڵێ تفلی بێواز
دڵم سەرپاك لە خۆڵتدایە ئەمشەو
پەڕوباڵی وەریوەو عار نانێ
مەلی تۆفان، چ بێ پەروایە ئەمشەو

.............................................................

## بێدەنگی

دەمێکە من لە دووی تۆ دێم، بە بێدەلگی وەکوو سایە
نە ڕۆژ خاك هێندە بێدەنگە، نە ئەستێرە بە شەو وایە
هەموو سینەم، بە عیشقی تۆ، وەکوو کوانوو بڵێسەی بوو
کە تینی پێ ئەما ئیدی، هەموو هەر خۆڵی پەربایە
هەتا سەرسەوزە دارستان، گەڵاو لاولاوی تێکداڵێن
خەزان، هەر تاکە دارێکی، لە بەر زریان، بەتەنیایە
بەفر بەرزایی داپۆشی، لە بەر مژ ئێستە نابینی
کە ئەم دەربەندە دڵتەنگە، چ تۆفێکی لە سەردایە
زمانێکم دەوێ بۆ دوان، کە بانگم کردی بێژی گیان!
چلۆن بدوێم لەگەڵ خەڵکێك زمانی بێوشەی وایە
هەتا دەنگی شەقەی باڵت نەیە، خامۆشە دڵ، بۆیەگمەی
ئەم کۆترە ڕامـدارە، دەمێك دێتو دەمێك نایە
دڵم وەك نەی دەناڵێنێ ، گەرووی سەد قومریی تێدایە
بەبێ پەنجەی هونەرمەندت، حەیف بێدەنگە ئەو نایە

.............................................................

دەشت خامۆشو هەوار چۆڵە
بایەو سەمای خاکو خۆڵە
گەڵا دەستی لەدار بەر بێ
دەڕوا هەتا ڕێی لەبەر بێ
ڕێچکە، ماری لەش تەزیوە
زوقمی لەسەر پشت باریوە
دەنگی پێیەکی پێدەوێ
خەوی قورسی، پێی بڕەوێ
لەوە دەترسێ ڕێی هەوار
کوێر بێتەوە بە بێ ڕێبوار
خۆڵەمێشی نێو ئاگردان
پەنای گرتوە لەبن بەردان
با، تووێ تووێ دەیلێسێتەوە
پشکۆیەك ناگەشێتەوە.
کانی، ژوانگەکەی دەشتودەر
ئێستە کەسی نایەتە سەر
بە چاو، سەرچاوە دەدوێنم
تاسەی تەنیایی دەشکێنم:
شەپۆلەکان دێنو دەڕۆن
هەر زیخو چەو هاودەمی تۆن
تەنیاییت چۆن بەسەر دەبەی؟
وردە بەردان چ لێدەکەی؟
پێیان بە خەمان دەوێری؟
یان کۆچی جوانان دەبژێری؟
جاران بەژنی بەرزت دەنواند
شۆخت دەدی، جوانت دەدواند
ئێستا چۆنی بە نامۆیی؟
کاروان لە منو لە تۆش ڕۆیی!
لەو زایەڵەو ژاوە ژاوە
ئێستا تەنها یادێك ماوە.
مەگەر تۆ وەفا بنوێنی
گیانێك وەبەر خولیام بێنی.